# نهێنی و ڕاستییەکانی
# ماسۆنیەت
## لە پرسیار و وەڵامدا


نووسینی: منصور عبدالحكيم
وەرگێڕانی: ئەمین بەرزنجی






# نهێنی و ڕاستییەکانی ماسۆنییەت

# لە پرسیار و وەڵامدا


نووسینی

مەنصور عبدالحکیم

وەرگێڕانی

ئەمین بەرزنجی

# پێناسی کتێب

ناوی کتێب: نهێنی و ڕاستییەکانی ماسۆنییەت لە پرسیار و وەڵامدا.

نووسینی: مەنصور عەبدولحەکیم.

وەرگێڕانی: ئەمین بەرزنجی.

پێداچوونەوەی: محەمەد محێدین.

نەخشەسازیی بەرگ: هیوا ڕەفعەت.

چاپخانە: چاپخانەی پەیوەند

تیراژ: ٢٠٠٠

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٥٩٦)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە.

# پێشکەشە بە:

- کوردانی سەر خاکەکەم.
- تۆی عاشقی ئایین و نیشتیمان و نەتەوە.
- ئەوانـەی ئەیانـەوێت لە ماسۆنییەت تێبگەن.

بسم الله الرحمن الرحيم

**خوای گەورە دەفەرمووێ:**

﴿ و يَمْكُرُونَ وَ يَمْكُرُ اللَّهُ وَ اللَّهُ خَيْرُ الْمَكرِيرِينَ ﴾ [ الانفال: ٣٠ ]

﴿ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمٰلاً ● الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا وَ هُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴾

[ الكهف: ١٠٣ – ١٠٤ ]

## پێشەکیی نووسەر

ان الحمدلله وحده نحمده و نستعينه و نستهديه و نستغفره و نعوذ بالله من شرور أنفسنا و من سيئات أعمالنا، أنه من يهديه ألله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادية له. وأشهد أن لا إله إلا ألله وأن محمداً عبده ورسوله وصفية من خلقه وحبيبة خيرمن بلغ عن ربه، نشهد قد بلغ ألامانة ونصح ألامة وكشف ألله به ألغمة وتركنا على المحجة البيضاء لايزيغ عنها الا هالك، صلوات ربي وسلامه عليه وعلى اله وصحبيه وسلم تسليماً كثيراً، ثم أما بعد..

ماسۆنی ترسناکییەکە بۆسەر هەموو ئادەمیزاد و دەستی بە بڵاوکردنەوەی ئەنجومەنەکانی کرد لە سەرانسەری جیهان بە چەندەها ناو و جۆرەها شێوە کە ڕووکەشییەکەی دڵنەرمی و بەخشندەییە و ڕاستییەکەیشی ئێش و ئازارە، هەرچەندە چەند کتێبێك دەرچووە دەربارەی ماسۆنی و ترسناکییەکانی، بەڵام ماسۆنییەکان خۆیان تاریکیی ڕاگەیاندنیان زاڵکرد بەسەریدا کە وایان کردووە ترسناکییەکانی ماسۆنی کەس نەیزانێت جگە لە هەندێك نەبێت لە سیاسەتمەداران و ڕۆشنبیران.

هەروەها ئاهەنگی ماسۆنییەکان لەڕۆژی ٢٠١١/١١/١١ لە قەدپاڵی هەرەمی گەورە لە شاری جیزە لە میسر کە ورووژا، زۆربەی ئەوانەی کە هیچ شتێکیان نەئەزانی دەربارەی ماسۆنی ئەیان پرسی ماسۆنی چییە؟ چیان دەوێت؟ هەرچەند زنجیرە پەرتوکێکی «حکومەتی نهێنی جیهانی» مان دەرکرد کە هەمووی باس لە ماسۆنی و ترسناکیی بۆسەر جیهان دەکات، بەڵام «دار الكتاب العربي» و خاوەنەکەی مامۆستا ولید ناصیف ویستی پەرتوکێکی سادەی گشتی لەسەر ترسناکییەکانی ماسۆنی دەربکات و منیش هەمان ویستم هەبوو کە لەسەر شێوەی پرسیار و وەڵام بێت و هەموو ئەو باسانەی کە پەیوەستە بە ماسۆنییەتەوە بەپێناسەکانی و ئەنجومەنەکانی و ڕێکخستنەکانی و مێژووەکانی بگرێتەخۆ.

له ڕاستیدا ماسۆنییەکان هەیانە جولەکەن و شوێنکەوتەی گشت ئایینەکانی تێدایە و گشتیان خۆیان فرۆشت بە شەیتانی گەورە ئیبلیس و شەیتانی مرۆڤ مەسیحی دەجال و دامەزرێنەری ماسۆنی کە ئیشی بۆ دەکات و فەرمانرەوایی جیهان دەکات. لەو چوارچێوەیەدا هەوڵ ئەدەین ئاسانیبکەینەوە بۆئەوەی زانیارییەکان بگاتە هەموو تەمەنەکان و کەسەکان. خوا سەرکەوتوومان بکات و ڕێنماییکارمان بێت لە ڕێگای خراپ، هەوڵمدا زانیارییەکان لە ڕێگای پرسیار و وەڵامدا بێت کە هەرچی پەیوەندی بە ماسۆنییەوە هەبێت و گرنگ بێت لای خوێنەر بخەینەڕوو.

داواکارین لە خودا کە یارمەتیدەرمان بێت لە دەرکردنی ئەم کتێبە و بیکاتە چاکە لە تەرازووی ڕۆژی دواییماندا و هەر خۆیشی دەسەڵاتدار و بە توانایە.

**وصل اللهم و سلم و بارك على سيدنا محمد و اله وصحبه اجمعين.**

**ـ مەنصور عبدالحكيم.**

# ١

## ماسۆنی دروستکراوی جوولەکەی دەجالییە

- پێناسە و مێژووی ماسۆنیی جیهانی.
- کۆمەڵەی نورانی بنچینەی ماسۆنیی نوێیە.
- کێ دامەزرێنەری کۆمەڵەی نورانییەکانە.
- بەشەکان و پلەکانی ماسۆنی.
- گرنگترین بیروبۆچوونەکانی ماسۆنی.
- هیرۆدوس ئەکریبا و ماسۆنی.
- کۆنترین لەبەرگیراوە (نسخە) کە تەمەنی هەزارەها ساڵە باس لە پێکهێنانی یەکەم شانەوی ئەنجومەنی ماسۆنی دەکات بە ناوی «هێزی نهێنی».

# پێناسە و مێژووی ماسۆنییەت

پ۱: هاوڕێ ئازیزەکەم پێم بڵێ که ئەبەوێت دەربارەی فیکرەی ماسۆنییەت بزانێت، دیارە کە هەر سەرەکییە ئەبەوێت بزانێت دەربارەی ماسۆنییەت یەکەم پرسیاری ئەوەیە کە ماسۆنییەت چییە؟

وەڵام: بەسادەیی دەتوانم بڵێم که ماسۆنییەت ڕێکخراوێکی جیهانییە ئەم ناوەش لە زاراوەی ئینگلیزی (Free Maconer) هاتووە واتە تەلاری ئازاد، وشەی ماسۆن واتە تەلار یان سەنگتاش، مەبەست لەمەش کەوا کۆمەڵێک بیناسار هەڵدەستان بە دروستکردنی کۆشك و کەنیسە لە سەدەکانی کۆن لە ئەوروپا، ئەم کۆمەڵە کۆنە ناسرا بە ماسۆنیی کرداری، بەڵام ڕوویەڕووی لەناوچوون بوونەوە.

کاتێك کە کۆمەڵێك لە ڕوناکبیرەن هاتنە ناو ئەم کۆمەڵە لە سەدەی هەژدەیەمی زاینیدا ئەوانە بنچینەی ماسۆنیی ئێستان، ئەمەش واتا و مەبەستی وشەی ماسۆنە.

بەڵام پاشماوەی کۆمەڵەی ماسۆنیی کرداری ڕێباز و ئاهەنگەکانی و هێماکەی هەر زاڵبوون بەسەر ماسۆنیی ڕامیاری و کردارییی جولەکەیی، و پەیکەری خەیاڵیی سوولەیمان بووە هێما و ئامانجی ماسۆنیی گەورە.

ڕێکخراوە ماسۆنییەکان لە ئەوروپا و ئەمەریکا و جیهان بە جۆرەها ناوی برایەتی ناسراوە وەك برایەتی خاچی پەمەیی و برایەتی کەللەسەر و ئێسقان و ڕۆتاری، و زۆرێك لە ناوەکانی تر..

شاهین مکاریوس دەگێڕێتەوە کە ئامادەبوون بۆ گۆڕینی ماسۆنیی کرداری بۆ ماسۆنیی هێمایی لە ساڵی ۱۷۱۷ لە (سان جان دیە) کە ئەم ئەنجومەنانە ناوی هێمایی

هاندەرانەیان هەیە وەك: قاز و تاج و دارسێو و کاسە و ترێ، ئەم چوار ئەنجومەنە ئەنجومەنی ( قەدیس مار ) سەرۆکایەتی دەکات کە ئێستا پێی دەوترێت ئەنجومەنی شوێنەوارە دێرینەکان.

بە کورتی و پوختی ناوی ماسۆنی لە کۆنەوە بەوە ناسراوە کە کۆمەڵەیەك یان سەندیکایەکی کرێکارانە بۆ هەر کەسێ کە پیشەی دروستکردنی کۆشك و کەنیسە بێت، هەر ئەمەش بوو کە لەدواتر پێی دەوترا ماسۆنیی کرداری، وە ئەم کۆمەڵەیە تەمان دوای ئەوەی کە کۆمەڵەی ( نورانیین ) دەستیان بە سەریداگرت لە سەدەی هەژدەهەمدا و لەوە بەدواوە بە ماسۆنیی هێمایی ناسرا.

هەروەها ئەم ماسۆنییە هێماییە بووە رێکخراوێکی جولەکەیی جیهانی و شارنەوەی ئامانجە راستەقینەکانی کە وێرانکاری و تیرۆرستی رێکخراو بە پتەوی، ئامانجە سەرەکیەکەی دەسبەسەراگرتنی هەموو جیهانە بەهۆی حکومەتێکی جولەکەی نهێنی کە مەسیحی دەجال سەرۆکایەتی دەکات خوا حەز کات دواتر باسی لێوە دەکەین.

****

پ٢: هاوڕێکەم پێی گوتم زۆر باشە بەڵام تۆ باسی نورانییەت کرد، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە سەبارەت بە(نورانیین) کە بنچینەی ماسۆنی ئێستان؟

لە وەڵامدا گوتم: ماسۆنی جیهانی پیلانێکی جوولەکەیی زایۆنیزمیە ڕێکخراوە بۆ سەرجیهان و ئایینەکان بەمەبەستی بنیاتنانی ڕژێمێکی جیهانیی یەکگرتوو لەژێر فەرمانڕەوایی زایۆنیزمی جولەکە، و ناوبانگی دەرکرد بەشێوەیەکی ڕێك لە ساڵی ٤٣ ی زاینی، هەروەها بە «هێزی نهێنی» ناسراوە و ئامانجی بە گژداچوونی شوێنکەوتووانی حەزرەتی (مەسیح)ە بە لەناوبردنیان و نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی ئایینەکەیان، ناوی ئەم ڕێکخستنەیش نرا (ڕۆڵەکانی بێوەژن).

لەدواییدا پیلانگێڕە جوولەکەکان دەرکەوتن لە ئەورووپا و دەستیانگرت بەسەر ئەورووپا بەهۆی کۆمەڵێك لە ئاڵوگۆڕکارەکانی دراو لە جوولەکەکان، پاشان هەر ئەوانیش خاوەن بانکەکان بوون و داوایانکرد لە دکتۆر ئادەم وایز هاویتی مەسیحیی ئەڵمانی ساڵی ١٧٧٠ دوای ئەوەی لە ئایینی مەسیحی دەرچوو، کە دەستورێکیان بۆ دابنێت، ئەو کۆمەڵەیە ناونرا (نورانیین) ئاماژە بە شەیتان کە ڕووناکی هەڵگرتووە بەبۆچوونی ئەوان، ئامانجی سەرەکی ئەم کۆمەڵەیە ئەوەیە کە دەستبگرن بەسەر ئەورووپا و جیهان بەگشتی، و ئەنجوومەنی نورانی دامەزراند، گرنگترین ئامانجە ئاشکراکانیان کە (ئادەم وایز هاویت) دایناوبوو ئەوەش کفرکردن بوو بە خودای تاك و تەنها و پێغەمبەرانی و پەرتووکە ئاسمانییەکان و هەموو غەیبەکان، و کارکردن بۆ لەناوبردنی گشت ئایینەکان و پیلانێك بۆ ڕووخانی گشت حکومەتەکان، بۆ ئامادەکاریی بانگەشەکردن بۆ حکومەتێکی یەکگرتووی جیهانی، فەرمانڕەوایی جیهان بکات بەسەرکردایەتی مەسیحی دەجال و پیاوەکانی لە جوولەکەی زایۆنیزم.

لە دوای ئاشکرابوونی پیلانەکانی نورانیین ساڵی (١٧٧٦)ی زایینی لە بافاریای ئەڵمانیا فەرمان دەرچوو بۆ دواکەوتنیان کە بچنە ناو ڕێکخراوی ماسۆنی کرداری کەوا سەندیکای

کرێکارانی بیناساز و پیشەوەرانە وەك لەپێشدا باسمان لێکرد.

بەڵام پیلانەکانی نورانیەکان کاتێ دەرکەوت دوای ئەوەی دەستیانگرت بەسەر زۆربەی وڵاتەکانی ئەورووپا و زاڵبوون بەسەر سەرۆکایەتی دەسەڵات تیایدا، و کۆمەڵەی پیلانگێڕان ناوی ماسۆنی جیهانیان بەدستهێنا، و کەرەسەی ئەندازە و کەرەسەی تەلار بووە هێمایان و بەپیرۆزیان ڕاگرت و بەوەش دەناسرێن.

****

پ۳: ئایا کۆمەڵەی (نورانیین) تا ئێستایش هەن؟

وەڵام: بەڵێ تا ئێستاش هەن و پێشەوای گشت ڕێکخراو و ئەنجوومەنە ماسۆنییە جۆراوجۆرەکانن و هەر خۆیشیان بەڕێوەی دەبەن.

ئەم ڕێکخراوەیش بەترسناکترین ڕێکخراوی ماسۆنیی پیلان دارێژ لەسەر جیهان ئەژمێردرێت چونکە تەنها بەردەوام نابێت بەڕازیکردن و دروشمی درۆ وەك ماسۆنی بەڵکو کارەکانی ئەنجام ئەدات لەژێر دروشمی عیلمانییەت، و بەرزکردنەوەی دروشمی عیلمانی چارەسەرە.

و نورانییەکان ئەوانەن داوای عیلمانییەت دەکەن ئێستا جگە لە جولەکە دژی ئایینەکانی ترن بەگشتی و ئاینی ئیسلام بەتایبەتی.

نورانییەکان لە ئەورووپا و ئەمەریکا بەشەیتان پەرست ئەژمێردرێن گوایە کە خوایەکەیان هەڵگری ڕووناکییە، بەڵام لە وڵاتە عەرەبییەکان وا خۆیان نیشان نادەن کە دژی ئایینەکان بن.

**پ٤: کێ دامەزرێنەری نورانییەکانە؟**

وەڵام: لەپشت دەرکەوتنی ئەم ڕێکخراوە ترسناکە جوولەکە (ئاڵوگۆڕکارەکانی دراو)ن لە ئەورووپا لە سەدەی هەژدەیەمدا کە دەوری بانکیان دەبینی (صەیارفەکان)، و داوایان لە (ئادەم وایز هاوپت) (١٧٤٨- ١٨٣٠) کرد کە ڕێکخراوی نورانیین دابمەزرێنێت.

ئادەم وایز هاوپت هەستا بەدامەزراندنی ئەنجوومەنی نورانی لە (بافاریا) ئەڵمانیای ئێستا سالّی ١٧٧٦ زاینی، ئەنجوومەنەکان بڵاوبوونەوە لە ئەورووپا و ئەندامی سەرکردەکانی ئەو وڵاتانەی لە خۆگرت و توانیان بپاچوونەوە بکەن بە پلەوپایە بەرزەکانی حکومەت.

لەدوای پیلانەکە کە ئادەم وایز هاوپت دایڕشتبوو لەلایەن حکومەتی بافاریا ئاشکرا کرا و دەسەڵاتداران هەستان بە داخستنی هەموو ئەنجوومەنەکانی نورانیین سالّی ١٧٨٤ زاینی، و ئادەم وایز هاوپتی لە کەنیسە دەرکرد بەڵام چالاکییەکانی نورانیەکان بەردەوام بوو لە فەرەنسا لەسەر دەستی میرابوا وە دانتون.

****

**پ٥: بیستمان کە دروشمی نورانیەکان ئەو دروشمەیە کە لەسەر یەك دۆلاری ئەمەریکی نەخشێنراوە، ئایا ڕاستە؟**

وەڵام: بەڵێ دروشمی نورانیەکان هەرەمی ماسۆنیە کە لەسەرەوەی هەرەمەکە چاوێك تیشك دەداتەوە بەجیهان و لای خوارەوەی ئاوی دەریایە، ئەم دروشمە لەسەر یەك دۆلاری ئەمەریکی هەیە و مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەکەی لەسەرە.

پ٦: ئه وهێمایانه چین که لەسەر دروشمەکانی نورانی ماسۆنی و لەسەر یەك دۆلاری ئەمەریکیش هەن؟

وەلام: دروشمەکانی ماسۆنی لەلای چەپی یەك دۆلاری ئەمەریکی هەیە و وشە و ژمارەی ماسۆنیشی لەسەرە، دروشمەکە لەناو بازنەیەکدایە لەخوار بازنەکەیش وشەی (TheGreatSeal) نووسراوە بەواتای مۆری گەورە، هەروەها هەرەمێکیش لەسەر شێوەی هەرەمی میسری لەناو بازنەکەدا هەیە و لەسەرەوەی هەرەمەکە چاوێك هەیە تیشك ئەداتەوە بەگشت لایەکدا ئەمەش ئاماژە بە چاوەکەی دەجال دەدات کە سیخوری ئەکات بەسەر جیهاندا و چاودێری هەموو شتێك دەکات، و لەژێر هەرەمەکە نووسراوە ڕژێمی جیهانیی نوێ (NovusOrdoseclarum).

لەژێر هەرەمەکەدا مێژووی یەکگرتنی نورانی و ماسۆنی جیهانی نوێیە لە یەك ڕێکخراودا نوسراوە یەکی ئایاری سالی ١٧٧٦ بەلاتینی ( MPCCLXXV ) زۆربەکالی.

هەروەها لەسەرەوەی هەرەمەکە دوو وشە نوسراوە (Coeptis Annuit) بەواتای ڕێبازەکەمان تەواوکرد ئەمەش ئاماژە بە یەکگرتنەوەی نورانیین و ماسۆنی دەدەن بۆ بەدەستهێنانی یەك حکومەتی جیهانی کە فەرمانڕەوایی هەموو جیهان بکات بەنوێنەرایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

هەرەم لەسەر دروشمەکانی ماسۆنی هێمایە بۆ قەلای پارێزەر و بۆ جیهانی نهێنی وشاراوەکانی کە دەورەی ماسۆنی دەدەن، و هەروەها پەیوەندی دەجالە کە مەسیحی جوولەکەی چاوەڕوانکراوە بە شارستانییەتی میسری و فیرعەونییەکان و هەرەمەکانەوە.

بات روبر تسون – سەرۆکی ئوسولی بڕۆتستانتی لە ئەمەریکا – ئەلێ ئەم دروشمەی سەر دۆلاری ئەمەریکی هیچ پەیوەندی بەئازادکردنی ئەمەریکاوە نییە چونکە ئەم درووشمە (ئادەم وایز هاویت) خاوەنیەتی وە دامەزرێنەری ڕێکخراوی شەیتانی نورانییە.

هەروەها ئەڵێ ئەو کەسەی دیزاینی بۆ دۆلاری ئەمەریکی دانا (تشارلز تومبسون) بوو کە ئەندامی کۆنگریس بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا ماسۆنی بوو، هەروەها (بیار هیس)ی نووسەر لە کتێبەکەیدا ئەڵێ دۆلاری ئەمەریکی دراوێکی زایۆنیزمیە، و پاشای زایۆنیزم خۆی مۆری لە دراوەکەی داوە کە فەرمانڕەوایی هەموو جیهانی پێدەکات و مژدە دەدات بە ڕژێمە جیهانییە نوێیەکەی.

****

پ٧: ئەبیستین کە ماسۆنی چەند بەش و پلەی هەیە، چین ئەوانە؟

وەڵام: بەڵێ ماسۆنی سێ بەشی هەیە: ماسۆنی گشتی کە زۆربڵاوە و ناسراوە لەناو خەڵك، ئەم بەشە لە ٣٣ پلەی هێمایی پێك هاتووە و دروشمەکەیشی (سەربەستی و یەکسانی و برایەتییە) کە جوولەکە و کەسانیتر لەخۆدەگرێت.

لەناو ئەم بەشەی ماسۆنی ٣٣ پلە هەیە بۆ بەرزبوونەوەی ئەندام بەگوێرەی چالاکی و توانا و تێگەیشتنی بۆ ماسۆنییەت، بەشێوەیەك کە ماسۆنی ئەبێتە بڕوا و ئایین و دڵسۆزی. هەڵبژاردنی ئەندام لەم ماسۆنییەدا دوای بینینی ئاهەنگێکی دیاریکراوی شاراوەی بتپەرستی لە ئەنجوومەنی ماسۆنی و هەیکەلی ماسۆنی دەبێت، کە لەدوای ئەمەدا دەبێتە ماسۆنییەك لە پلەی یەکی ناشارەزا، هەروەها بەرزدەبێتەوە بۆ پلەی دۆستی پیشە یان هاوڕێ هەروەها بەننای گەورە یان مامۆستا و بەم شێوەیە.

هەروەها ماسۆنی پاشایەتی کە زۆربەی ئەندامەکانی جوولەکەن و پێیان دەوترێت هاوڕێیان، و ڕێگە نادرێت جگە لە جوولەکە بچێتە ناویان تەنها ئەوانە نەبێت کە گەیشتوونەتە پلە بەرزەکانی ماسۆنیی هێمایی.

بەشی سێیەم ماسۆنیی گەردوونییە، ئەم بەشە هەرە بەرزترینیانە و هەموو ئەندامەکانی لە جوولەکەیە، پێیان ئەوترێ داناکان و سەرۆکەکەیشیان پێی ئەوترێ دانای

گەورە کە سەرچاوەی فەرمانەکانە بۆ هەموو ئەنجوومەنەکانی ماسۆنی کە هیچ کەس ئەندامەکان و سەنتەری چالاکییەکانی نازانێت.

ماسۆنییەت بەگشتی لای ساویلکەکان وایە کە کۆمەڵەیەکی ویژەیی ئەخلاقییە، خزمەتگوزارە بۆ کاری خێرخوازی، بەلام لە راستیدا دامەزراوەیەکی جوولەکەی زایۆنیزمییە، پلەکانی، فێرکاریەکانی و دروشمەکانی نهێنین کە بیرۆکەکانی لەناوبەرن بۆ هەموو کۆمەڵگەیەك و گشت ئایینەکان.

****

**پ٨:** رێگاکانی ماسۆنی لەسەر ئاستی جیهان چین؟

وەڵام: پێنج رێگا هەن بۆ ماسۆنییەت لەسەر ئاستی جیهانی کە چەند هۆکارێك هاوکاری بوون بۆ پێکهێنانی، لەوانە هۆکاری مێژوویی، کە یەکەم ئەنجوومەنی ماسۆنی بەجوولەکەبووی هێمایی دامەزرا لە ئینگلتەرا، هەروەها پێنج رێگا ماسۆنییەکە ئەمانەن:

١. رێگای یۆرك: پێك دێت لە سێ پلە یەکەم دەسپێکەر، دووەم هاورێ و سێیەم مامۆستا، وە بەپلە بەرزەکان ناناسرێت و هەروەها پلەیەکی بەرزیان بۆ زیادکرد ئەوەیش ماسۆنیی بەڵێننامەی پاشایەتییە.

لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا پلەکانی ماسۆنی لە رێگای یورك بووە دوانزە پلە کە چوار دەسەلاتداری ماسۆنی سەرکردایەتی دەکەن.

٢ ـ رێگای ئیسکتلەندی کۆن :ئەم رێگایە لەفەرەنسا سەری هەڵدا کەزانیاریکانی وناوی پلەکانی بەفکرەی ئازاد تۆکمە کرا کە لەسەدەی هەژدەدا فەرەنسا سەرۆکایەتی دەکرد وە٣٣ پلەی هەیە بۆهەر پلەیەك فێرکارییەکی تایبەتی خۆی هەیە وەدابەش ئەبێ بە

سەر چوار بەشەوە کە ئەمانەن: ماسۆنی هێمایی شین وەماسۆنی سووری (سوڕچاپ) وەماسۆنی فەلسەفی (( رەش )) وەماسۆنی بەڕێوەبردن (( سپی )) .

٣ ـ ڕێگای فەڕەنسی نوێ: ئەم ڕێگایەش لەفەرەنسا سەری هەڵدا وەبەبەرەوپێش دەچوو تاساڵی ١٨١٦ی زاینی ئەمەش لەڕێگای ئیسکتلەندی دەچێت . تەنها جیاوازی ئەوەیە کە زیاتر هاوچەرخیترە.

٤ ـ ڕێگای ئیسکتلەندی: ڕێگایەکی ماسۆنی مەسیحیە.

٥ ـ ڕێگای سویدی: لەسوید و نەرویج و دانیمارك بلاّوە وە بنچینەکەی ((سوید بنرنج))ە وەلەچواربەش پێك دێت کە دوانزە بەش لە خۆدەگرێت کەتێکەڵەی ماسۆنی ئینگلیزی و ماسۆنی فەرەنسی یە.

****

پ٩: بۆچی پیلانگێرەکانی نورانیەکان تەنها کۆمەڵەی بیناسازەکانیان هەڵبژارد لەناو هەموو پیشەوەرەکانی تر؟

وەلاّم : زۆربە سادەیی ئەڵێین: هەڵبژاردنی جولەکە ئاڵوگۆڕکارەکانی دراو لە نورانیەکان بۆکۆمەڵەی بیناسازەکان لە ئەوروپا دوابەدوای ئاشکراکردنی نیەت و پیلانەکانیان بوو هەروەك باسمانکرد، لەبەرئەوەی ئیشوکاری ئەم کۆمەڵەیە بیناسازی بە بۆیەجولەکە ویستی چونیان بۆناو ئاینەکان لەژێرناوی بینای ئازاد دوریی لەپەرژینیان بۆئاینێکی دیاریکراو لەگەڵ بانگەشەی درووشمی فریودان کە ئەویش برایەتی یەکسانی وئازادیە، وەچەند ئاهەنگێکیان زیاترکرد بۆی لە ئەورلت و ئاینەپتپەرستەکان لەگەڵ پارێزیکردنیان لە کەرەسەی کۆمەڵەی بیناسازەکان کە هێمایە بۆیان .

****

پ١٠: بەرزترین کەسایەتیەکان کێن کە هەوڵیاندا بۆدامەزراندنی فکرەی ماسۆنی لەکۆندا؟

وەڵام : هیرودوس ئەکریبا پاشایەك لەپاشاکانی ڕۆم ئەم فیکرەیەی دامەزراند بە هاوکاری دوو ڕاوێژکارە جولەکەکەی:

- حیرام ئابیود:جێگری سەرۆك. وە موئاب لامی: ڕازگری یەکەم، وە ئەوکۆمەڵە ناونرا خاوەن بیرۆکەی ((هێزی شاراوە)) کەخاوەن فیکرەی پیلانگێری بوون وەئامانجیان بەپەندکردنی نەسارییەکانبوو وە لەناوبردن وڕاونان و قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوەی ئاینەکەیان.

لەکاتی دامەزراندنی ناونرابوو (( هێزی شاراوە )) وەلەچەندسەدەیەکەوە ناونراوەماسۆنیەت بۆئەوەی لەسەندیکای بیناسازانی ئازاد درووشمیان پێبدرێت تاکو لەوڕێگەیەوە ئیشی تیابکەن، وە ئەو ناوەیان پێوەلکێنرا کە ڕاستییەکەی نیە کەلەپێشدا باسمانکرد، وە ئەمە قۆناغی یەکەم بوو.

قۆناغی دووەمی ماسۆنی لەساڵی ١٧٧٠ زاینی دەستپێدەکات لەڕێگای ئادەم وایزهاوبتی مەسیحی ئەڵمانی کە لەئاینی مەسیحی دەرچوو وە بوبە لوتکەی ماسۆنی وەپیلانی نوێی بۆماسۆنی دانابەمەبەستی دەسبەسەراگرتنی بەسەرجیهان وەپرۆژەکەی لەساڵی ١٧٧٦زا تەواوبوو،وە لەم ماوەیەدا یەکەم ئەنجومەنی دانا بەناوی (ئەنجومەنی نورانی) هاوتا بۆشەیتان کەوا ئەیپە رستن .

وەتوانیان هەزارپیاو هەڵخەڵتێنن لەگەورەسیاسەتمەداران ورۆشنبیران وەئەنجومەنێکی سەرەکی دامەزراند پێیان بەناوی ئنجومەنی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، وەئەوسیاسەتمەدارانەی ملکەچکرد بۆ خزمەتکردنی ماسۆنی، وەدروشمی برقەداریان بڵاو ئەکردەوە بۆ شاردنەوەی ڕاستیەکانیان کە زۆرێك لە موسوڵمانیان لە خشتەبرد.

گرگترین کەسایەتیە سەرکردەکانی ماسۆنی:

- (( میرابو )) یەکێکە لەبەناوبانگترین سەرکردەی شۆرشی فەرەنسا.
- مازینی ئیتالی کە کارەکانی گەراندەوە بۆ بنچینەکانی خۆی لەدوای مردنی وایز هاوپت
-
- ژەنەرالی ئەمەریکی ( ئەلبرت مایك ) دوای تەواوکردنی سەربازی رق و کینەی رژاندە سەر گەلان لەرێی ماسۆنیەوە وەپیلانی لەناوبردنی کردە بواری جێبەجێکردنەوە .
- ( ولیوم بلوم ) ی فەرەنسی کەراسپێردراوبوو بەبلاوکردنەوەی حەلالکردنی سێکسی وە کتێبێکی بلاوکردەوە بەناوی ( هیچ شتێك لەهاوسەرگیریکردن خراپەکاریتر نیە).
- ( کودێرلۆس) ی جولەکە خاوەنی کتابی (( پەیوەندیە ترسناکەکان )) .
- (ولاف ئەریدج) لەکۆنگرەیەکی ماسۆنی رایگەیاند لە سالی ١٨٦٥زا لەشاری ئەلبنش لەناوکۆمەلێك قوتابی ئەلمانی وئیسپانی و روسی و ئینگلیزی و فەرەنسی ووتی: ((پێویستە مرۆڤ سەربکەوێت بەسەر خودا، وەجەنگی بۆراگەیەنێت وەبچێتە ناوئاسمانەکان وەپارچە پارچەیان بکات وەك کاغەز )) . — پەنا ئەگرم بەخودای بالا دەست — .
- (( ماتسینی جوزیبی )) ١٨٠٥ — ١٨٧٢زا .

وە هەروەها لە کەسایەتیەکانیان: جان جاك رۆسۆ و ڤۆلتێر (لە فەرەنسا ) وە جرجی زێدان ( لە میسر ) وە کارل مارکس و ئنجلز ( لە روسیا) کە ئەم دوانەیان ماسۆنی پلە٣١ بوون وەسەر بە ئەنجومەنی ئینگلیزی بوون، وەلەو کەسانە بوون کە ماسۆنی نهێنیان بەرێوە ئەبرد وەبەتەگبیری ئەم دوانە بەیانی بەناوبانگی شیوعی دەرچوو .

پ١١: گرنگترین بیروباوەری ماسۆنی چییە ؟

وەلآم: لە گرنگترین ئامنج وبیروباوەڕیان :

ـ باوەڕ نەکردن بە خواو پێغەمبەرەکانی وکتابەکانی وە بەهەموو غەیبەکان، کە ئەمانە هەموی بە قسەی پڕوپوچ وخرافیات دادەنێن.

ـ کارئەکەن بۆ لەتبونوهەلگێڕانەوەی ئاینەکان.

ـ کارکردن بۆ ڕوخانی حکومەتی شەرعی وەلەناوبردنی وەلەناوبردنی ڕێکخراوی دەسەلآتی نیشتمانی لەوولآتە جۆراوجۆرەکان وەدەسگرتن بەسەریاندا .

ـ بەدروست دانانی جنسی وەبەکارهێنانی ژن وەك هۆیەکی دەس بەسەراگرتن .

ـ کارکردن بۆدابەشکردنی گەلان جگە لەجولەکە کە یەکتربەخراپ بزانن وە ململانێکردنی ناو یەکتری بەبەردەوامی .

ـ پڕ چەککردنی لاینەکان وبەرپاکردنی کارەسات لەناویان بۆبەگژاچونی یەکتری.

ـ بلآوکردنەوەی ژەهری دوبەرەکی لەناو وولآتێکدا و ژیاندنەوەی گیانی تیرەگەرایەتی وکەمەنەتەوایەتی ورەگەزپەرستی.

ـ ڕوخاندنی بنەمای ڕەوشت و ئاین و بیروبۆچون وبلآوکردنەوەی ئاژاوە وە حەلآلکردنی تیرۆرکردن وبێبڕوایی.

ـ بەکارهێنانی بەرتیل بە سامان وجنس لەگەل هەموو کەس بەتایبەتی خاوەن پلەوپایەهەستیرەکان بۆ پەیوەندیکردن پێیانەوە بۆخزمەتکردنی ماسۆنی.

ـ هەرکەسێ بکەوێتە داوەکانیانەوە چواردەری ئەدەن لەهەمولایەکەوە، بۆئەوەی بەچاکی کۆنترۆڵی بکەن وە چۆنیانبوێ بەوشێوەیە ئاراستەی بکەن وەهەموو

فەرمانەکانیان جێبەجێ بکات وەك بچوکێکیان.

ـ ئەو کەسەی ئەیەوێت بچێتە ناویانەوە مەرجی بۆدائەنێن کەئەبێ دووربێت لە هەموو پەیوەندیەکی ئاینی و رەوشت ونیشتیمانی وەهەموو دڵسۆزییەکی تەنها بۆ ماسۆنی بێت.

ـ ئەگەر ئەو کەسە لارییەك یان سەرپێچیکردنێکی کرد پەندێکی واگەورەی بۆ هەڵبەستن کە ئامانجەکەی کوشتن بێت.

ـ سوود لەهەرکەسێ وەربگرن و پێویستیان پێنەما کارێك ئەکەن بۆلەناوبردنی بەهەرهۆیەك بێت.

ـ کارکردن بۆ دەسبەسەراگرتن بەسەر هەموو سەرۆك وولاتەکان بۆزامنکردنی جێبەجێکردنی ئامانجە وێرانکارە کانیان.

ـ کۆنترۆڵکردنی کەسەباڵادەستەکان لەهەموو بوارەکاندا بۆئەوەی کارەکانیان بەچاکی بڕوات.

ـ کۆنترۆڵکردنی ئامێرەکانی پڕوپاگەندەو رۆژنامەو چاپ وراگەیاندنەکانوەبەکارهێنانی وەك چەکێکی چالاکی لەناوبەری کوشندە.

ـ بڵاوکردنەوەی هەواڵی جوراوجۆرو بێبنەماو ئاشوبەی درۆ ، هەتاوادەرکەوێت کەڕاستە بۆئەوەی هۆشی جەماوەلر بکۆڕن و ڕاستیەکان لەناویان بسرنەوە.

ـ نوغرۆکردنی گەنجانی کوڕان و کچان لەخراپەکاری وە ئامادەکردنی هۆکارەکان بۆیان وەکاری سیکسی لەگەڵ (مەحرەمدا) بە گونجاو دانا وەنابوتکردنی پەیوەندی هاوسەرگیری وەلەناوبردنی پێکەوەبەستنی خێزان.

ـ بانگێشتکردن بۆ ڕاگرتنی مندالبونی ئارەزومەندانە و دیاریکردنی ڕەگەز لەلایەن موسڵمانانەوە.

ـــ کـۆنترۆڵکردنی ڕێکخـراوە نێونتەوەییـەکان بەسـەرۆکایەتی یـەکێك لەماسـۆنییەکان وەکرێکخـراوی وولاَتەیـەکگرتووەکان لەپـەروەردەو زانست و ڕۆشـنبیری و ڕێکخراوەکـانی چاودێری نێونەتەوەیی،وەڕێکخراوی قوتابیانو لاوان لە جیهاندا.

****

پ١٢: ئەندامی نویێ چۆن لە ئەنجومەنی ماسۆنی وەردەگیرێت ؟

وەلاَم: ئەنـدامی نـوێ لەکەشـێکی سـامناك و ترسـناك و نـامۆ وەردەگیرێـت ،بەچـاو بەستراوی ئەبردرێت بۆلای سەرۆك ، دوای ئـەوەی سـوێندی خـوارد کـەنهێنیان بپارێزێت چاوی ئەکەنەوەو سەرسام ئەبێت بە بینینـی شمشێر لەسـەر گـەردنی ڕاگیراوە وەکتـابی پەیمانی کۆنیش لەبەردەستی دانـدراوە وەلەژوورێکدایـە کـەمێك تاریکـە کەللەسـەری مـرۆڤ وکەرەستەکانی ئەندازەیی کەلەدار دروستکراوە لەوژوورەدایە، ئەمانە هەموی بۆترساندنی ئەندامی نوێیە .

وەهەرکێیـەك پەیوەنـدیان پێـوە بکـات مـەرجیان ئەوەیـە کەئـەبێت وازبهێنێـت لـە هەرپەیوەندیـەکی ئـاینی ونیشـتیمانی و تـایفی ،وە ئەمـەش کەمـەنێ مێـژوونوس ئـەڵێن: ((ئـامێری ڕاو بەدەسـتی جولەکەیـە وەململانێـی پێئەکـەن سـەرۆك کۆمەڵـەکان وەلـەم ڕێگایەوە ڕۆڵەو گەلانی نەزانی پێهەڵئەخەڵەتێنن )) .

ڕاستیەکانی ماسۆنی دەرناکەوێت بۆ شوێن کەوتوانی تەنها بە بەرزبەنـەوەی پلـەکانی نەبێت وەپلەکانیش ٣٣پلەیە.

هـەموو ماسـۆنیەك لەجیهانـدا پرگـالێکی بچـوك وگۆشـەیەك هەڵـدەگرن لەبەرئـەوەی دروشمی ماسۆنیە لەوکاتەوەی کە سلیمان سەلامی خوای لێبێت بینای هیکەلی پیرۆزی لـە قودس پێبنیاتناوە .

ماسۆنیەکان ووشەی(( ئەندازیاری گەورەی گەردوون )) زۆر ئەڵێنەوە کە مەبەستی
واتێدەگەن مەبەستیان خودای تاك وتەنهایە،بەڵام لەڕاستیدا مەبەستیان ((حیراما)) یە کە
گوایە ئەندازیاری هەیکەلە وەئەوەش گەردونە بەبۆچونی ئەوان.

****

پ١٢: هیردوس ئەکریبا کێیە؟ وەپەیوەندی بەماسۆنیەوەچییە ؟

وەڵام: دامەزرێنەری کۆمەڵەی هێزە شاراوەکانە کەوا یەکێکە لەناوەکانی ماسۆنی یان
قۆناغی یەکەم لەماسۆنیەت دوای ساڵی ٤٣ی‌زا کاتێك کەرێکخراوێکی نهێنی شەیتانی
دامەزراند بۆبەرەنگاربونەوەی نەسرانیەکان لەسەر دەستی پاشای ڕۆمانی هیرودوس
ئەکریبا (کەلەساڵی٤٤زا کۆچی دوایی کرد) بەیارمەتی هەردوو ڕاوێژکارە
جولەکەفەرەنسیەکەی (حیران و لامی) وەحەوتیتریش لەشوێنەوارناسەکانی فەرەنسی .

وەدابەشبوونی هەیکەلی ئەوکاتەبەمشێوەیەبوو :

١ـ پاشای ڕۆمانی هیرودوس ئەکریبا:(سەرۆك).

٢ـ ڕاوێژکارەجولەکەکەی حیران ئابیود: (جێگری سەرۆك)،کەخاوەنی بیرۆکەی هێزی
شاراوەو پێشنیاری ناوی ((هێزی نهێنی )) بوو( The Mysteyious Force )
وەئەمەش ناوی کۆی ماسۆنی بووکەوا گۆردرا لەدوایدا کەجۆرێکە لە هەڵخەڵە تاندن و
ساختەکردن

٣ ـ ڕاوێژکارێکی تری جولەکە موئاب لامی:( ڕازگری یەکەم ) کە کەسی سێیەمە لەو
سیانەی کەپێشنیاری دروستبوونی (جموجوڵیان) کردبوو.

٤ ـ موئاب لیڤی .

٥ ـ ئادۆ نیرام کوڕی ئەبدا: لێپرسراوی باج بوو، کە ئیسرائیلیەکان ڕەجمیانکرد بەبەرد لە ئیسرائیل کە پاشا (ریهو بوام) کردیەبان عارە بانەیەك وەبەخێرایی گەیاندیە وولاتی یەهودا.

٧ ـ یەعقوب ئابدون.

٨ ـ ئانتیباس.

٩ ـ سولمون ئابیدون.

١٠ ـ ئاشاد ئابیا.

****

پ١٤ : کۆنترین بەڵگە چیە کەلەسەر ماسۆنی بدوێت ؟

و : هیرودس جولەکە نەبوو بەڵکو پت پەرستبوو بۆ بەرژەوەندی وایبەباشزانی نەسرانیەکان لەناوببات کەوای دانابوو ترسناکە لەسەرپاشای ڕۆمانی پت پەرست.

ئەم بۆچونەی کۆتایش بەپێی ئەو زانیاریانەی سەدەی چواردەیەمی زاینی پێمان گەیشتووە، کەبەڵگەنامەیەکی دەگمەن دەرکەوت مێژوی دروستبونی ماسۆنی دیاریدەکات.

ـــ وەلە بەناوبانگترین باسی ئەم بەڵگە نامەیە ((ولیەم غای کار)) لەکتابە زۆر بەناوبانگەکەی ( أحجار علی رقعه‌الشگرنج ) (بەردەکان لەسەر تەختەی شەترەنج).

ـ هەروەك باسکرا((مایکل هاوارد)) لەکتابەکەی (پارێزگاری نهێنیەکان لە کاتی ساڵکانی ٥٠٠٠ ی ڕابردوو ) .

هـەردوو نووسـەر باسـیان لـەوەکردووە کـە ئـەم بەڵگەنامەیـە ووتـاری نهێنیی لەکۆبونـەوەکانی ماسـۆنی لەسـەرەتاوە تـاکو سـەدەی بیسـتەم ، وەئەمـەش تاکی سەرچاوەیە کە باس لەسەرەتای ماسۆنی دەکات.

هـەردوو نوسـەرەکە پشتیان بەسـتووە بـەدەقی بەڵگەنامەیـەك کـە پێکهـاتووە لـە دەستوسێك کـە بـەعیبری نووسـراوە، یـەکێك لـە نـەوەکانی میراتگرانـی دامەزرێنـەری ماسـۆنی بۆیماوەتـەوە ، کـەوردەکاری کۆبونـەوەکانی دامەزرێنـەرە سـەرەکیەکانی ماسـۆنیەکانە لەسـاڵی ٤٣زا ، بـەڵام بـەنرخێکی زۆرگـران فرۆشـتویەتی بەیـەکێ لەسەرکردەکانی بەرازیل وە لەدوایێ ماوەیـەك بڵاوکرایـەوەو قسـەو باسـی لەسـەر کراوەو وەشیکاری بۆکراوە ...وەدڵنیابوون لەوەی کە بەڵگەنامەیەکە تەمەنی هەزارەها ساڵە.

غـای کـار پشـتی بەسـتووە بـە وەرگێـڕدراوی ئینگلیـزی لەدەسنووسـە سـەرەکیەکی کەبەزمانی عیـبری نووسـرابوو لەسـەر مێـژووی ماسـۆنی کـە هـەموو دامەزرێنـەرەکانی لـە جوولەکـەبوو. وەئـەم بەڵگەنامەیـە گواسـترایەوە لەتۆدامەزرێنەرەکـە تـەنها بۆئەوانـەی کەپەیوەندی ڕاستەوخۆیان هەبووە بەدامەزرێنەرەکانەوە.

ـ چیرۆکەکە ئەڵێت: یەکێك لەکۆپیە ئەسڵیەکە لەبەڵگەنامەکە گواسـترایەوە لـەمونـاب لیڤیعیەکێکەلەدامەزرێنـەران بۆجۆزیـف لیڤـی لەسـەدەی حەڤدەیەمـدا، بـەڵام لێـی دزرا لەلایەن (دیساجلیرز) دامەزرێنەری ماسۆنی نوێ.

ـ دوای ئەوەی ( لیڤی) تیرۆرکرا لەلایەن دیساجلیرز. کوری جۆزیف ئابراهام لیڤی مرد لـەدوای دووسـاڵ لەهاوسـەرگیریەتی لەگـەل ئیسـتر. ئیسـتر سـەرلەنوێ شـویکردەوە بە(ئابراهام ئابیود) کە ئەچێتەوە سەر وەچەی حیرام ئابیود(دامەزرێنـەری ڕاستەقینەی کۆمەڵەی ماسۆنی کۆن) بەپلەی یەکەم. ئابراهام ئابیود کۆپیەکی تری هەبوو لەدەسنوسە سەرەکیەکە. کچەتاقانەکەیان،هەروەها ئیستەر، کەشویکرد بە سمئویل لورانس

ـ کوڕەکەیان جوناس لۆرانس کوڕێکی هەبوناوی سمونیلێ بوو لەژنی یەکەمی بەلاّم لەدوایدا ژنێکی هێنا بەناوی جانیت کە پروستانتی مەسیحی بوو. ئەم دەستنووسە تەنهایە گەیشتە دەست جوناس کەحەزی خۆی دەربڕی بۆبلاّوکردنەوەی. بەلاّم جوناس تێرۆرکرا لەبەرئەوەی بوو بەمەسیحی وەبەدەستهێنانی بە ناپاسایی لەمێژوودا لەبەرئەوەی نزیك نەبوو یان ڕاستەوخۆ ناچێتەوە سەر ڕەچەڵەکی لیڤی .

ـ وەسێتەکەی جۆناس بەجێنەهێنرا هەتا کاتی کورەزاگەورەکەی لورانس لەدلیك بووی ساڵی ١٨٦٨زا کەپروستانتی بوو، وەهەستا بەوەرگێڕانی بەڵگە نامەکە لەزمانی عیبرییەوە بۆزمانی ئینگلیزی ،وەبلاّوکردنەوەی لە پەرتوکێك بەناوی ( ڕەوانندنەوەی تاریکی، بنچینەی ماسۆنیەتە ) وەئەم ڕستەیەش لەکۆتایی پەرتوکەکەدلیە: ( بەرێز لورانس ـ نەوەی کۆتا بۆ خاوەن مێژوو دەسنوسی عیبری )

وەئەمەش دەقی بەشێکی گرنگە لە بەڵگە نامەکە:

لەساڵی ٤٣زا پاشا هیرود ئاگریبا ئەندامانی دادگای قودسی بانگکرد

- پاشا هیرود ئاگریبا.
- بە پێشنیاز کردنی حیرام ئابیود.
- بەڕەزامەندی موئاب لیڤی.
- ئادونیرام.
- جوهانان.
- یەعقوب ئابدون.
- ئانتیباس.

. سولومون ئابیرۆن.

. ئاشاد ئابیا.

وتی :

برایانی ئازیز ئێوه نەپیاوی پاشان و نەیاریدەدەری ، بەڵکو ئێوه کۆڵەکەن بۆپاشار گەلی جولەکە، تائێستا شوێنکەوتوی دڵسۆزن، بەڵام لەئێستاوە ئەبنە برا .

ـ باهەموومان تێبگەین وەهەروەها باهەموومان لەبیرمان نەچێ،ئەم کۆبونەوە زێڕینە بۆئەم کۆمەڵە نوێیە لەسەربرایەتی دروستبووە .

ـ براکانم، چینی ئەرستۆکراسی (چینی دەوڵەمەند ) وەهەروەها چینی گشتی شۆڕشی گیانی و ڕامیاری هەبستی بەوەکردووە کە هۆی دەرکەوتنی (یەسوع ) ە لەناو خەڵکیدا ، بەتایبەتی لەناو ئێمەی جولەکە.

ـ هێزێکی گەورەمان تیابەدیکرد، کە بەخشییان بەو کۆمەڵەیە کەناویانلێنا قوتابی. کۆمەڵەیەکیان پێکهێنا بەناوی ئاین هەروەها بەهۆی ئەوانەوە ناونرا. ئەم ئاینە سەپێنراوە لەدوای هەنگاوێکەوەیە لەناوجەرگەی دامەزراندنی ئاینە کەمان وەلەناوبردنی .

ـ بەهرەی پێغەمبەرایەتی وتوانای موعجیزەی خستە پاڵ خۆی. بانگەشەی مەسیحی چاوەروانکراوی بۆخۆیکرد کەپێغەمبەرەکانمان باسی هاتنیان ئەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها پیاوێکی ئاساییە وەکوخەڵکانی تر، دورن لە هەرنیشانەیەك لە ڕوحی خودایی، وەگەڕاندنەوە بۆ ئەوپەڕی دووری ڕاگرتنی بیروباوەڕی جولەکایەتیمان کەئێمە سورین لەسەر نەکشانەوەمان تەنانەت لەسەر خاڵێکیش.

ـ هەرگیز دان نانێین بەکەسێکی وەك مەسیح........، ئەزانین کە مەسیحی چاوەروان کراو ڕون نەبووەتەوە لەناومان، وەهیچ نیشانەیەك نابینین کە هاتنی بسەلمێنێت. کەواتە

هەڵمانکرد کەڕێگەماندا بەگەلەکەمان کەدوای کەون وە هەڵخەڵەتێن، ئیدانەی خۆمان ئەکەین بەتاوانێکی کارەساتبار.

ـ ((... لەخاچماندا، مرد وەناشتمان، وەپاسەوانمان بۆدانا بۆئەوەی پاسەوانی گۆڕەکەی بکەن. بەڵام بانگەشەیان کرد کە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان وە جارێکیکە زیندوئەکرێتەوە سەرلەنوێ، !...دیارنەما بەڕێگایەکی نادیار، سەرەڕای بەئاگابونێکی زۆر وبەپەرۆشەوە وسەرەڕای داخستنێکی چاکو نهێنیەکی تەواو.

ـ نەمانی لەناوگۆڕ، ئەی هاوڕێیان، گورزێکی کوشندەبوله رکابەرەکەی وە هاندانێکی بەهێز بوو بۆهاندانی قوتابیەکانی و شوێنکەوتوانی، وەبەبەردەوامی لە بڵاوکردنەوەی فێرکاریەکانی وەبیسەلمێنێ لە دڵنیایی خواپەرستیەکەی...

ـ هەرچۆنێك بێت، ئێمە دان بەهیچ ئاینێکی تر نانێین جگە لەئاینەکەی خۆمان، ئاینی جولەکە کە لەباووباپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە. ئەرك پێمان دەڵێ کەبیپارێزین تادواسات.

ـ[ ئەم خورپەیە چاوەڕوان نەدەکرا هەرگیز. ئەم هێزە نادیارە کەس نەبوو خەونی پێوە ببینێ، هێرشیان کرد وە بەردەوام ئەبین لەهێرشکردن، سەرەڕای هەموو شتێك، سەرسوڕهێنەرە !زۆری ژمارەیان . لەگەڵما سەرنج بدەن چۆن کوڕ لەباوك جیادەبێتەوە، برالەبرای، کچ لەدایکی، هەمویان خۆیان بەختکرد بۆ پەیوەندیکردن بەم کۆمەڵیە. نهێنیەکی گەورە چواردەوری ئەم فەرمانەی داوە. چەندە لەپیاوەکان، چەندە لە ژنان، چەندە لە خێزان بەتەواوەتی وازیان لەئاینی جولەکە هێنا تاوەکو دوای ئەوفێڵبازانە بکەون، ئەوانەی سەر بە یەسوع بوون. چەندجار هەڕەشەیان لێکرا لەلایەن قەشەکان و دەسەلاتەوە، بەلام بێ سوودبوو ].(( تبديد الضلام: اصل الماسونية ـ لورانس لورانس ، صفحة ٥ـ ٤٧ )) .

لەسەرەتادا ناوی ماسۆنی کۆن ((هێزی شاراوە)) بوو، وە:

- حیرام ئابیود، ڕاوێژکاری پاشا کە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ماسۆنی کۆن بوو وەئەویش پێشنیاری ناوی کۆمەڵەی نهێنی کرد بەگوێرەی ئەم بەڵگەنامەیە، وە ئەمەش هۆیەکەی بوو:

- (( ... وادیارە لێرە دەستێك هەبێت، هێزێك، نهێنییەك، شاراوەیەك، کەواسزامان دەدات بەبێ ئەوەی توانای بەرگریمان هەبێت. وادیارە ئێمە هەموو هێزێکمان لەدەس داوە بۆبەرگریکردن لەئاینەکەمان وەخودی بونیشمان .

- بەڕێزتان، لەسەر ئەوبەڵگەیەی کە هیچ هۆیەکی چالاك نیە بۆپێشخستنی بیروباوەڕمان، وەهیچ هیوایەکی چەسپاو نیە بۆ هێرشکردنە سەر ئەو هێزە، کە بەدڵنیاییەوە شاراوەیە، وەلەو کاتەدا هیچ سوێندێکیتر نەبوو جگەلەدروستکردنی هێزێکی شاراوە، هاوشێوە بەوەی (بەرەنگاربونەوەی لوغز بەلوغز ) وەگەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەرکی سەپێنراومانە، جگە لەوەی ئەگەر هاتوو بیرۆکەیەکی چاکترت هەبێ، بۆدامەزراندنی کۆمەڵەیەك کە کاریگەریەکی گەورەتری هەبێت کەهێزی جولەکەکۆپکاتەوە بەو هێزە نهێنیە. واچاکترە کەکەس هیچ شتێك نەزانێ دەربارەی ئەم کۆمەڵەیە، بیروباوەڕو کردارەکانی. تەنها ئەوانەی کە بەڕێزتان هەڵیئەبژێرن کەدامەزرێنەرن، تەنها ئەوانە ئەزانن نهێنی دامەزراوەکە.

سوێندی ترسناك بۆ ئەندامان:

پێویستبوو لەسەر نۆ دامەزرێنەرەکە سوێند بخۆن سوێندێکی بەسام ئەمەش سوێندەکە بوو:

( من، فلانی کوری فلانم ) سوێند ئەخۆم بەخودا، بەکتابی پیرۆز وە بەشەرەفم، بووم بەئەندام لەنۆ دامەزرێنەرەکەی کۆمەڵەی، هێزی نهێنی، پابەند ئەبم بەوەی کە ناپاکی

یەکەم بەرامبەر برا ئەندامەکان لەهیچ شتێك کەزیانیان پێبگەیەنێت، وەهیچ ناپاکیەك دووەم بەرامبەر بڕیارەکانی کۆمەڵە، پابەندئەبم کەبەپێی بنەماکانی بڕۆم، وە بەچاکی سێیەم بەرامبەر ناوەڕێکخراوەکانمان، بۆ دامەزرێنەرەکە. بەگوێڕایەڵی وبەوردی، بەچێژو بەپەرۆشییەوە. پابەند ئەبم بەوەی کە کاربکەم بۆزیادکردنی ئەندامانی. پابەند ئەبم بەوەی کەبەردەوامگەری هەرکەسێك ببم کەدوای ڕێنماییەکانی یەسوعی دەجال بکەوێت وەبۆ ماوەیەکی شوێنکەوتوانی هەتاکو مردن. پابەند ئەبم بەوەی کەهیچ نهێنییەك نەدرکێنم بەوەی لە نێوانمان پارێزراوە. ئێمە تۆکەسین: ئەلەنێوان ئەوانەی دێنە ناومان وەنە لە دەرەوەی ئەو ئەندامانەی لە ناوماندان.

ئەگەر ئەم سوێندەم بەدرۆ خوارد وەناپاکیم کرد لەئاشکراکردنی هەر نهێنییەك یان هەرفەرمانێك لە دەفتەکانی یاسا پارێزراوەکان کە پارێزراوە لەنێوانمان وە نێوان هێگرووەکانمان؛ ئەوا لەلایەن لیژنە هەشت کەسیەکە هەموو مافێکیان هەیە کە بمکوژن بەهەر شێوەیەکی گونجاو.

## واتای ئامێر و هێماکانی ماسۆنی:

ئەگرمیای پاشا باسی ئامێرو هێماکانی کرد کە ماسۆنیەکان بەکاریان هێناوە:

ئەرکی ئێستا پێویستە لەسەر ئێمە کە هەموان واتێبگەیەنین کە کۆمەڵەکەمان زۆر کۆنە...ئەم فێڵە دڵنیادەکەینەوە بە بەکارهێنانی ئامێرەکانی بیناسازی کە( هیرام ) بەکاریهێناوە ئەندازیاریبیناسازی لە بینای (هیکەلی سلێمان)، وەك گۆشە، قیبلەنوما، قازمەتەرازوو، چەکوش...هتد، هەموو ئەو شتانەی کە لەدار دروستکراوە کە(هیرام ئەبیف) هەیبوو، هەموو کۆبونەوەیەك بەلێدانی سێجار لەسەریەك بەم چەکوشە دەستپێدەکات لەبەرئەمەش تاکوتا هەریادی دەکەینەوە لەسەدەکانی داهاتوودا، ئێمە

لەهاچماندا، وەبەم چەکوشە برمارمان لەدەست و قاچەکانی داکوتی، وەکو لەمنەدا،
ئەستێرەی سێ نیشک ئاماژە بەسێ برمارەکە دەدات.

وەلەناو کۆمەڵەکەمان پلەبەندی ئەنجام ئەدەین ، هەروەکو پێشوتر باسمان کرد
کە(٣٣) پلەیە، کە ئاماژە یە بۆ تەمەنی دەجال (مەبەستی مەسیحە سەلامی هەوای
لێبێت). وە هەر پلەیەك ناوێکی لێدەنێین وە هێمای هاوشێوەی تر دروست دەکەین ئەم
شتانە هەموی بیرۆکەی خۆمو بیرۆکەی براکانم موئاب و هیرام بوو. وانای ئەم هێمایانە
نابێت هەرگیز بزانرێت، ئەبێ تەنها لەناو هەرێزمان بمێنێتەوە. وەسەبارەت بەبڕیاری
دیکەو ئەندامانی سەر بە کۆمەڵەکەمان ڕوانینیان بۆ ئەم پێداویستی و کەرەستانە بەسە
بۆبڕوابونیان کەکۆمەڵەکەمان لەسەردەمی (سلێمان) یان پێشتر دامەزراوە. بۆهەربرایەکی
ترمەیە پێشنیازی هێمایەکی نوێ بکات.

بیر لەچی ئەکەنەوەو تێبینی چی ئەکەن برایان سەبارەت بەوەی پێشکەشتانم کرد؟

شەش پیاوەکە ڕازیبون بەبێ ڕەخنە گرتن، وەهەموو شتێك تۆمارکرا. ( لە دەستووسی
سەرەکی: شەش پیاوو سێ پێشنیازکار: پاشا، موئاب، هیرام).

هەروەها پاشا وتی: دەبا دڵخۆش بین! دەبا سێجار ئەم چەکوشە سەرکەوتنەوە
بوەشێنین، بەهێمای مردن بۆ دەجالی دوژمنمان،هێمای دامەزراندنی ئامانجە بەڕێزەکەمان
کە بە بزماری برایەتی و یەکگرتن چاکسازی دەکەین! دەبا هەموومان بەخۆشیەوە
هاواربکەین: بۆپێشەوە بۆ سەرکەوتن!

لەکاتی دانیشتنی یەکەم، نۆ دامەزرێنەکە هێمایەکی نوێیان درووستکرد بۆپاراستنی
جل و بەرگ لەقوڕ. ئەمەو لەگەڵ گشت ئامێرەکانی ماسۆنی هەمووی ئامانجە بۆ
شاردنەوەی مەبەستی راستەقینەیەو دڵنیابوونەوەیەکی ( ساختەیە) کەئەم کۆمەڵیە
ئەگەڕێتەوە بۆسەدەکانی کۆن.

پاشای سەرۆك ووتی: من لەگەڵ دەسەڵاتەکەدام وەك سەرۆك ئەوان وەکپاشا، پلەی (۳۳)م بەخشی بە هەر یەکێك لەئێوە. بەرزترین پلە لەکۆمەڵەکەمان لەوکاتەوەی میراتی برلمان بنیاوك ئەبێت لە منداڵییەوە. وەبەماسیبی کەس حگە لە دایکی بیوەژنەکەی، داواکارم کۆمەڵەکەمان بەناوی بیوەژن ناوبەرین. وەداواکارم رەزامەندبن لە ئێستا بەدواوە ناوی دامەزرێنەران ئەبێتە رۆڵەکانی بیوەژن وەهەر ئەندامێکی کۆمەڵەکەش بە کوڕی بیوەژن ناوئەبرێ تا کۆتایی رۆژگار.

ئەم بەڵگە نامەیە لە دەنگی ماسۆنیەت و لەنەوەی ئەو دامەزرێنەرانەوە دەرچووە، بەڵام لێرەدا کێ گومانی هەبێ لەراستی یەکەی. وە ئەتوانین چەند پەنجەیەکی ماسۆنیەتی بخوێنینەوە لە پوختەی بەڵگەنامەکە.




هێمای ماسۆنی لەسەر یەك دۆلاری ئەمەریکەی




تەرخانکردنی ئەندامی نوێ لەماسۆنی و کۆمەڵەی هێزی شاراوە




هیرۆدۆسی دووەم ئەگریپا دامەزرێنەری

هێزی نهێنی

# ٢

## ماسۆنی جیهانی و زایۆنیزمی جیهانی

- ماسۆنی جیهانی چی یە؟

- ئامانجەکانی زایۆنیزمی جیهانی چی یە؟

- پەیوەندی زایۆنیزم بە ماسۆنیەوە چی یە؟

- جیاوازی نێوان زایۆنیزمی جیهانی نوێ و رێکخراوەکانی ماسۆنی.

# زایۆنیزمی جیهانی و پیوەندی بە ماسۆنیەوە:

پ١٥: هاوڕێکەم پێی ووتم: هەرچەندە ماسۆنی ئێستا بە جولەکە کراوە و ئامادەی جولەکەیی بەسترلو بە زایۆنیزمەوە. ئەمانەویٚ شارەزای زایۆنیزمی جیهانی بین ؟

پێم گوت: زایۆنیزمی جیهانی ڕێکخراوێکی جولەکەی جێبەجێکەرە کاری سەرەکی جێبەجێکردنی پیلانە کانی جولەکەی دەججالە بۆ گێڕانەوەی وولآتی بەنی ئیسرائیله کەلەسەر دەستی پاشای بابلی ((نەبو خوز نەسر)) لە ناوچوو لەپێش زاینی وەندراو نانەوەی هەیکەل سولێمان کە دووجار وێرانکرا؛ یەکەمیان لەسەر دەستی پاشای دارا نەبو خوز نەسر پێش زاینی وە جارێکیتر سالّی ٧٠ی زاینی لەسەر دەستی ڕۆمانی((تیتس)) وە ئامانجی جیهانی بزنەوان دەس بەسەرا گرتنی جیهانە و خۆئامادەکردنە بۆ فەرمانرەوایی مەسیحی دەجالی چاوەروانکراو.

وەناو نرا بە سەهیوٚنی بەناوی چیای سەهیوٚن کەئەکەوێتە باشووری ((بیت المقدس)) کەجولەکەکان بەپیرۆز ڕاینەگرن.

زایونیزمی نویٚ دەسپێکردن وسەرهەلّدانی لەسالّی ١٨٠٦زا دەسی پێکرد کاتێك کە ئەنجومەنی بالآی جوولەکە کۆبونەوە بەبانگێزی ناپلیۆن بۆقۆرخکردنی حەزەکانی جوولەکە وەبەدەسهێنانیان بۆ هاوکاریکردنی، وەپێکەیاندنی ((هێرتزل)) ی جوولەکە کەدلوای یەکەم کۆنگرەی جولەکەی زایۆنیزمی نوێی کرد لە شاری ((بال)) ی سویسری سالّی ١٨٩٨زا کەبریاردرا لەسەر پیلانەکەی جوولەکەی زایۆنزمی بۆدەسبەسەراگرتنی جیهان کەتاکو ئێستاش لە جێبەجێکردندایە.

****

پ١٦: ئامانجەکانی زایۆنیزمی چین؟

وەڵام: زایۆنیزم دوو باڵی هەیە ڕامیاری و ئاینی، وەبۆ هەریەکێکیان ئامانجی خۆی هەیە، ئامانجی ئاینی بۆجولاندن و گەرمبونی ئاینی لەنێوان جوولەکە و جیهان وە گەڕانەوەیان بۆ خاکی دیاری کراو بەداگیرکردنی خاکی فەلەستین، وەهەروەها بۆ جولاندنی گیانی جوولەکە بۆ شەرکردن بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجە.

وەئامانجی ڕامیاری بۆئەوەیە کەفەلەستین بکاتە وولاتێکی جولەکە وەدانپێنانی نێودەولتی بە وولاتی جولەکە لە سەر خاکی فەلەستین، زایۆنیزمیەکان زۆرلە ئامانجەکانیان بە دەست هێنا کە یەکەمیان دامەزراندنی وولاتی جوولەکەیە لە فەلستین بەناوی ئیسرائیل ساڵی ١٩٤٨ز.

****

پ١٧: ئایا پەیوەندی زایۆنیزمی بە ماسۆنیەوە چییە؟

وەڵام: زایۆنیزمی جیهانی لە سکی ماسۆنی جیهانی دەرچوو وەئەمەش جولەکەیە بەرەگەز بەشێوەو هەڵسوکەوت و ئامانجی، وە ئامانجی سیاسی قۆناغی و جیهانی هەیە، وەزایۆنیزم ئامێرێکی جێبەجێکەری فەرمی یە بۆئامانجەکانی جوولەکە.

((مۆسینیۆ جوان)) ئەڵێ جولەکەو ماسۆنی یەك شتن وە ئەمەش ترسناکێکی گەورەیە وەمەسەلەیەکی مان ونەمانە بەگوێرەی تێروانینیان بۆ هەموو گەلانی سەر زەوی.

وە((نیستا ویستر)) ئەڵێ بەریتانیەکان ئێستا فەرمان ڕەوایی ئینگلتەرا ناکەن، لەبەر ئەوەی لەژێر کۆنترۆڵی دیکتاتۆریەتی شاراوەی جولەکەیە.

وە((یەهوزابوش)) ی جوولەکە ئەڵێ: ئێمەی جوولەکە مەبەستی سەرەکیمان ئەوەیە دەست بەسەر هەموو جیهان بگرین ئەو مەبەستەی کەتائێستا زۆربەی کەس پێیان

ئەزانیوە، ئەو ڕۆژە دێت بەخێراییەکی نزیك وە نزیکتر لەوەی کە ووڵاتانی جیهان بەری لێدەکەنەوەکە بە مەسیح ناونەبرێت، وەئەمەش بۆیان ڕوون ئەبێتەوە کاتێ کە مژدەی ئەم دەسبەسەراگرتنە دەستی بە سەر هەڵدان کرد.

وە(( یوسف الحاج)) لە کتێبەکەی ((هیکل سلیمان الوکنی القومی للیهود)) ئەڵێ زایۆنیزم بزوتنەوەیەکی جولەکەیە کە داواکارن بەنوێکردنەوەی دروستکردنی ووڵاتێکی جولەکە وە بنکەکەی فەڵەستین بێت وە بنیاتنانەوەی هەیکەلی سلێمان کە ئەوەش هێمای ڕەگەزایەتیانە.

****

پ١٨: کەواتە جیاوازی نێوان زایۆنیزم و ماسۆنی چییە؟

وەلآم: زایۆنیزمو ماسۆنی یەك خێزانن.. وە ئامانجیشیان یەکە.. بەلآم زایۆنیزمی جولەکە لە شێوەدا پوختەیە وەلەناوەڕۆکیشدا خزمەتی ئامانجەکانی جولەکە ئەکات بەڕێگایەکی ڕاستەوخۆ .. وەبانگێشە دەکات بۆ بنیاتنانی نیشتیمان بۆخۆیان لەسەر خاکی فەڵەستین وەگەڕاندنەوەی فەرمانڕەوایی بەنی ئیسرائیل لەژێر ڕابەرایەتی مەسیحی دەجال .. وە بنیاتنانەوەی هەیکەل لە مزگەوتی ئەقسا..

بەلآم ماسۆنی جولەکەیەکی شاراوەیە، درووشمی مرۆڤایەتی گشتی پیشان دەدات.. وە ئەمەش بزوتنەوەیەکی عیلمانی بێباوەڕی نهێنیە؟ خزمەتی جولەکە ئەکات بەڕێگای ناڕاستەو خۆ، وەجولەکەو کەسانی تر لەپلەکانی لەخۆ دەگرێت..

وەهەریەك لەماسۆنی وزایۆنیزم خزمەتی بەرژەوەندیەکانی جولەکە دەکەن وەخۆئامادە کردن بۆ مەسیحی دەجال و فەرمانڕەوایی جیهان و بەجیهانی بوون.

دەرکەوتنی زایۆنیزمی نوێ لەسەدەی حەڤدەی زاینی دەستی پێکرد، وە لەسەدەی

نۆزدەدا بەئاشكرا دەركەوت بۆهەموو جیهان كە بزوتنەوەیەكی ڕامیاریە بانگەشە دەكات بۆ گرتبونەوەی جولەكە لەنیشتمانێكی تایبەت بەخۆیان، وە((هیرتزل)) بووەسەركردەی ئەم بزوتنەوەیە و وەبەسرۆكایەتی ئەویش كۆنگرەی ((بال)) بەسترا لەسویسرا ساڵی١٨٩٧زا..بەڵام بیرۆكەی زایۆنیزمی مێژووەكەی ئەگەڕێتەوە بۆ بیرۆكەی كۆن سەرهەڵدانیشی لەگەڵ سەرهەڵدانی جولەكەیە، وەهەروەهابیروبۆچونی ماسۆنی پیلانگێری بەچەند قۆناغێك تێپەری، وەچەند ناوێكی لێنراوە وەك هێزی نهێنی و ماسۆنیزم.

وەلەدامەزراوەكانی بیرۆكەی زایۆنی نوێ كە هاوبەشە لگەڵ بیرۆكەی ماسۆنی لەجێبەجێكردندا:

١ـ جولەكە گەلی هەڵبژاردەی خوایە، وەگیانی ((بەنی ئیسرائیل)) بەشێكە لەخوا.

٢ـ فەڵەستین ئامانجی سەرەكی نییە بۆجولەكە، بەڵكو ئامانجی هەمووجیهانە، بەڵام ئیسرائیل لەبنەڕەتدا بیرۆكەی خاچپەرستەكانە جولەكە سوودی لێبینی وەئێستاش زایۆنی هەڵیئەسوڕێنێ.

٣ـ جولەكە لە هەموو بەشێكی جیهان نوێنەرایەتی یەك گەل دەكەن.

****

پ١٩: ئایا ئە توانی بەكورتی باسی ((تیودۆر هیرتزل)) دامەزرێنەری زایۆنیزمی نوێ بكەیت؟

وەڵام: تیودۆر هیرتزل بەباوكی گیانی و دامەزرێنەری یەكەمی زایۆنیزمی جیهانی دادەنرێت، كەبزوتنوەیەكی ڕامیاری داگیركارە كە لەناو جولەكە بڵاویكردەوە بەوەسفی نەتەوایەتی و نیشتیمان پەروەری وەناوی چارەسەركردنی كێشەی جولەكەی لێنابوو،

وەبەرهەڵستی تێکەڵبوونی جولەکەی دەکرد لەووڵاتەکانی خۆیان، وەهانیانی ئەدا بۆ کۆچکردن بۆ فەڵەستین لەبەر ئەوەی کە مەڵبەندی مێژوویی و ئاینیان تیابدا هەبوو. وەتەماحکارییەکانی زایۆنیزم یەکیگرت لەلایەن هێرتیزڵەوە بەئامانجەکانی داگیرکاری لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی جولەکە لە فەڵەستین.

سەرکردەی زایۆنیزم هەستا بەڕێکخستنی بزوتنەوەیەکی شەیتانی لەبانگەشەیکدا کە داڕشترلوێکی جولەکەیی بوو لەجۆرەهاهەبەستەکان بیاریکرا لەسەر جولەکە کە دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆیان پێک بهێنن. وەجولەکەیی ئەم دەوڵەتە پێویستە پشت بەهیچ لایەنێکی ئاینی یان فەلسەفی بۆجولەکە و ڕێزگرتنیان نەبەستێت. بەڵکو ئەبێت پشت ببەستێت بە شێوەی نەتەوایەتی جولەکەیی.

هێرتزل یەکەم کەس بوو لەدانانی بیرۆکەی دامەزرتنی قەوارەی جولەکە لەفەڵەستین. ئەم دامەزراندنە لەلایەن هێرتزڵەوە خاڵێکی گۆڕانکاری بوو لە ئامانجەکانی بزوتنەوەی زایۆنیزم، تەنها بەئاڕدنی ڕۆشنبیرییەکی ساکار بۆدروستبوونی کیانێکی نەتەوایەتی کەبووە هۆی پاراستنی هەندێک لە زاڵبوونی ڕامیاری بۆجولەکە دەستە بەردەکات لە کاروباری ژیانیان. وەئە گەر بێتوو بزووتنەوەی زایۆنیزم وەک و بیر و باوەڕێکی ڕامیاری دەستی پێکردبێت ئەوا لە ڕێی هێرتزڵەوە پێشکەوت بۆ (( دامەزراوەیەکی کیانی ڕامیاری، دواتر بەرز دەبێتەوە بۆ دەوڵەتێک لە خاکێکدا کە زۆربەی دانیشتوانی جولەکە نەبن )).

وە ئەم بیرۆکەیە ڕووبەڕووی گرنیبوونەوەیەکی بەهێز بووەوە لەلایەن کۆمەڵانی لەجولەکە دوای دەرکەوتنی هێزی گەورەی ڕامیاری بۆ جولەکەی نوێنەرانی تیۆدۆر هێرتزل.

تیۆدۆر ئامانجەکانی بزوتنەوەی زایۆنی دیاریکرد لەوکاتەدا بەوەی (( بەدیهێنانی پەیوەندی جولەکە لە سەرانسەری جیهاندا ونەهەرکوێیەک کەهەن، بە سۆزی نەتەوایەتی وە دڵنیابوون لەوەی کە فەڵەستین ببێتە مێژووی و وڵاتێکی نەتەوەیی بۆ جوولەکە لە هەر کوێیەک بن)).

وەلە ساڵی ١٨٩٥دا هێرتزل،دامەزرێنەری ڕاستە قینەی زایۆنیزمی نوێ، نووسیویەتی وە لەژێر فەرمانڕەوایی خۆی کۆنگرەیەی زایۆنی یەکەم بەسترا ساڵی ١٨٩٧دا نووسیویەتی لەکتێبە بەناوبانگەکەی ((دەوڵەتی جوولەکە)).

****

پ٢٠: ئایا پەیوەندی هەیە لەنێوان زایۆنیزمی جیهانی و پرۆتۆکۆلەکانی دادوەرانی زایۆنزم؟

وەڵام : بێگومان پەیوەندی هەیە لەنێوانیاندا، پرۆتۆکۆلەکان نەخشەی پیلانەکانی جولەکەی دیاریکرد لەسەر جیهان و گەلەکەی، وەرێکخراوەکانی زایۆنی و ماسۆنی هەڵئەستن بە ئەنجامدانی ئەو پیلانانە وەبۆنمونە باسی ئەو ڕوداوانە دەکەین لەململانێی تایەفەگەری لەجیهان وە ڕۆڵی زایۆنیزم تیایدا، وەچیش لە بروتۆکۆلەکانی زایۆنیزم نوسراوە.

زایۆنیزمی جیهانی بیروباوەڕی دەمارگیری و توندڕەوی ئاینی بڵاوکردەوە لە چەمکەکانی ئاینی و بیروباوەڕەکاندا لەمدواییانەدا، وەلە سەرانسەری جیهاندا وەبە تایبەتی لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست و کیشوەری ئاسیاو ئەفریقیا، وە ویستی کەبیروباوەڕی دەمارگیری و توندڕەوی ئاینی زیندوو بکاتەوە بۆزاڵبونی بەسەر ڕامیاری ژیان لەجیهاندا بەگشتی وەلە ڕۆژ هەڵات بەتایبەتی وەبە تایبەتی تر لەفەلەستین، ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەڵێ(( مەبەست هۆکار دێنێتەوە))؟

وە پلانەکانیان ڕووندەبێتەوە کەتۆمارکراوە لە(( پرۆتۆکۆڵەکانی دادوەرانی زایۆنیزم ))

وە ئەوانەشی پرۆتۆکۆلی داوانکارین لە رەوای گەلانی جیهان و مرۆڤایەتی، پڕە لە رق وکردنی هاراوەو رق گشتیت دووان، بەو رۆچوونەی کە هەموو گەلان لە ئاژەڵن وەخودا دروستی کردوون بە روخساری مرۆڤ بۆ خزمەتکردنی جولەکە وەبانگەشەی ئەوە بۆخۆیان دەکەن بە ((گەلی هەڵبژێردراوی خوا))، وە جولەکە مافی ئەوەی هەیە کە هەموو گەلان بکوژێت، لەبەر ئەوەی ئاژەڵن وەهەموو شتو مەك و سامانەکانیان تالآن بکەن لەبەر ئەوەی دەڵێن مافی جولەکەیە، بەڵام گەلی جولەکە لە نتفەی ئادەم و حەووان، ئەمانە لە زانیاری گۆمەڵە یاسای جولەکە هاتووە کەلەلایان کتابێکی پیرۆزە، وەئەمەش زانستەکانی (الحاخامات)ی جولەکەیە، ئەم کتابەش لەمەرە خوارەوەی جەهەننەمەوە در چووە بەلای ئەوانەوە،

وە هەندێ لەو پرۆتۆکۆلانەی کە هاتووە ئەو پیلانانە روون ئەکاتەوە، کە چەند نموونەیەکی لێباسئەکەین:

- لەپرۆتۆکۆل یەکەم هاتووە:(( چاکترین ئەنجام بتەوێ بەدەستی بێنی بۆ دەست بەسەراگرتنی گەلان توندوتیژی و تۆقاندنە، وەهەڵگیرساندنی ئاگری دەماربزوێنی ئاینی و توندرەوی بۆ پەناو کردنی دەس بەسەراگرتنمان بەسەر ئەم گەلە ئاژەڵانە کە بەهەموو شتێك باوەردەکەن لەرێی ئاینەوە))..

- هەروەها لەپرۆتۆکۆل نۆیەم هاتووە:(( لە ئێمەوە تەوژمی ترس و تۆقاندن دەرچوو کە چواردەورەی خەڵکانی داوە، وە لە جۆرەها خەڵکی لەخزمەتماندان سەربە جۆرەها مەزهەبی فکرین، وەلە جۆرەها زانست لەوانەش: داواکارانی تەختی پاشایەتی، خواستی سەروەت وسامان، سەرۆکەکان بە تایبەتی و بەگشتی، سۆشیالیستەکان، کۆمۆنیستەکان، وە هەڵگرانی خەونەخۆشەکان لە هەموو پارتێك، وەبریارماندا ئەوانە هەمووی بۆ رووناکی کارەکانمان بێت بۆخزمەتکردنمان وە لەپێناوماندابێت))..

- وەهەروەها هاتووە:(( لە ئێمەوە جموجووڵی نهێنی و وێرانکەروو هێلانە نهێنیەکان

دەرچووە، وەبلۆین پیسی و هۆڵە کانی ڕابواردن، وە تۆ قاندنە ئاینیەکان بۆسڕینەوەی هەموو ئاینەکان لەسەر ڕووی زەوی وە ئاینی جولەکە ئەمێنێتەوە و ئەبێتە ئاینی هەموو جیهان وەهیچ ئاینێکی تر نامێنێت، وەئەمانە هەمووی ئامادەیە پێکەوە بتەقێنەوە لەپایتەخت و شارەکان و گەڕەکەلوول هەموو دامودەزگاو تۆمارەکان لەناو ئەبات))..

ـ هەروەها لەپرۆتۆکۆلی دەیەم هاتووە: (( .. ئێمە کەمیکرۆبی نەخۆشی لەناوچوون بلاوئەکەینەوە بە ئەنقەست لەجیهاندا بۆنەوەی هەموو گەلان لەناوبەرین ))..

ـ لەپرۆتۆکۆلی یانزەدا هاتووە:(( نابێت بۆدوو وولات یان دوو گەل یان دوو پارت یان دوو کۆمەڵ یان دوو مەزهەب یان دوو تایەفە یان دوو هێز..هەرچەند بیهێزبن ڕێکەوتن نامە بکەن پێکەوە ئەگەر لەو ڕێکەوتنە سودی بۆئێمە تیانەبێت یان بەرژەوەندیەك خزمەتی بەرژەوەندیەکانمان بکات))..



تیۆدۆر هێرتزل دامەزرێنەری زایۆنیزمی نوێ وە هەر ئەمیش زایۆنـــیزمی نوێکردەوە و هاوکار و ڕۆشنبیری بوو وە نازناوی پاشای دوورکراوەی لێنرا

# ٣

## دەیکەی ڕێکخستن و پلەکانی ماسۆنی

ـ هەیکەلی ڕێکخستنی ماسۆنی چی یە؟

ـ گرنگترین پلەکانی ماسۆنی چی یە؟

ـ ووشە نهێنیەکانی ماسۆنی چی یە؟

ـ سوێندی پیرۆزی ماسۆنی چی یە؟

پ ۲۱: هاوڕێکـەم ووتـی: هەرچـەندە ماسـۆنی ڕێکخراوێکـە زۆربەتوونـدی ڕێکخـراوە لـە شێوەی ڕێکخستنی باندەکانی مافیا دەچن، ئەپرسم لێت: هەیکـەلی ڕێکخـستنی ماسـۆنی چی یە؟

وەڵام : زۆر لە بارەگاو دەستەی بەڕێوەبەرو ڕێکخستن هەن بۆ ڕێکخراوی ماسۆنی لـە چەندەها وڵاتانی جیهان وەبەشێوەیەکی وورد نازاندرێت تاچەند پەیوەنـدیان هەیـە ئـەم لقانە لەگەڵ یەکتریدا وەئەگەر بێت و بارەگایەکی سـەرەکی هـەبێت بۆگشـت ماسـۆنیەکان لەجیهان. لێرەدا ئەگەرێك هەیە کەزۆربەی لقەکان لە ژێر سەرپەرستی بارەگای گـەورەدان کەلەساڵی ۱۷۱۷زا دامەزرا لە بەریتانیا، وەسـەرۆکی ئـەم بارەگایـە پێـی ئـەوترێت زانـای گەورە وەئەم بارەگایەش بـەزۆری لـە فـەرمانڕەوایی شارسنتانیەت دەچێت وە بارەگـای تریش هەیە کەناوی بارەگای گەورەی لەخۆی ناوە، وەئەبێت ئەندامانی بارەگایـەکی تـری گەورە ئامادەی کۆبونەوەکانی بارەگایەکی گەورەی دیکەی دیاریکراو ببن، بـە مـەرجێك هەردوو بارەگاکە دانبەیکتری بنێن، وەئەگەر ئەوشـەرتانە نـەبێت لەنێوانیانـدا ئـەوانانوانن پابنێنە بارەگای گەورەی ترەوە،

بارەگای گەورە لە لەندەن و ئێرلەنداو ئیسکتلەندا هەیـە، وەلـە وڵاتـە یـەکگرتووەکان بارەگای گەورە لە هەموو ولایەتێك هەیە، وەزۆر بارەگا هەیـە لەهـەر وڵاتێکـی ئـەورووپی، ڕێکخـراو هەیـە تـەنها ئەندامـە زاناکـان وەردەگرێـت وەك ڕێکخـراوی Scottish Rite کەبارەگای سەرەکی هەیە پێیناڵێن بارەگای سەرەکی، بەکورتی چـەند نیشـانەیەك هەیـە کە مەرکەزی بوون لەنێوان ئەو بارەگایانە نییە، بەڵام هەندێك بۆچونی وایـە کـە یـەکگرتن وپەیوەندییەکی قووڵ هەیە لە نێوان ئەو لقانە.

بنکەی گەورە لە بەریتانیا کە لە ساڵی ۱۷۱۷زا دامەزراوە بـە کـۆنترین بنکـە دادەنرێـت وەدوای ئەویش بنکەی گەورە لە فەرەنسا دێت کە ساڵی ۱۷۲۸زا دامـەزرا. وە گشـت ئـەو لقە گەورانە پێکهات لە یەکگرتنی لقە بچوکەکان لەگشت وڵاتەکانی ئەمـەریکای لاتینـی و

بەلجیکا. بارەگای گەورە لە فەرەنسا وەك دەستیەکی بەڕێوەبردنی بالاَ دادەنرێت بەلام باقی لقەکان لەجیهان بە بارەگای گەورە لە بەریتانیا وەك سەرچاوەیەکی بەرز دادەنرێت. لە وولاتە یەکگرتووەکان لەهەر وولایەتێك دەسیانکرد بە دانپیانان بە یەکتری وەبارەگا گەورەکان لە وولاتە یەکگرتووەکان لەدۆخی یەکگرتندان لەگەلّ بارەگای گەورە لەبەریتانیا.

وە ئەنجومەنی جیهانی هەیە کە هیچ ئەنجومەنێکی نویّ ناکرێتەوە بەبیّ سەرپەرشتی و ڕەزامەندی ئەنجومەنی گەورە نەبێت.

ماسۆنی مافی هەیە کە پلەی ماستەری بەدەست هێنا سەردانی هەر ئەنجومەنێك بکات، وە ماسۆنیەکان ڕەخنە لە بەکارهێنانی ووشەی ئەنجومەن ئەگرن وەناوی (( پەرستگای فەلسەفەو هونەر)) بەشیاو ئەزانن. بۆپشتیوانی لە بیرورای ماسۆنیەکان، وەئەوبارەگایانە یان شوێنەکانی کۆبونەوە بنیات نراوە لەلایەن ماسۆنیە سەرەتاکانەوە لەنزیك کارەکانیانەوە لە پرۆژە بیناکانیان وەپالّ پشت بە هەمان بیرو باوەڕ وەشوێنکەوتوانی ڕزگاری خوازان زیادکرا بۆ ماسۆن یان بیناسازەکان لەبەرئەوەی بیناساز بوون یان ئەندازیاربوون لەکاتی پشوودا یان ئازادی لە کارکردن، وەکۆئەبوونەوە لەو شوێنانە بۆپشوودان و ڕاوێژکردن. بارەگای گەورەو ئەنجومەن بلاّوبووەتەوەلە چەند وولاتێکی جیهان. وەلەگرنگترین ئەنجومەنی شاراوە لە شێوەی یانەی کۆمەلاّیەتی یان لیونز کە شێری کردووەتە درووشمی خۆی وە بنکەی سەرەکی لە شاری ( ئۆك برۆك) ە لەوولایەتی ئیلنەوی ئەمەریکی، وە ئەوەی شایانی باسە ووشەی لیونز واتە(پاسەوانانی هەیکەل) ئاماژە بۆئامانجی ماسۆنی گەورە وەئەوەش بینای هەیکلی سولێمانە. کە ملفن جۆنز دروستی کرد سالّی ١٩١٥ وەیەکەم جار یانەی لیۆنز دەرکەوت لەئاياری ١٩١٧ لە ئوتێلی لاسال لە شیکاغۆ. وەئەم ناوەش پێك هاتووە لە پیتە سەرەتاکانی ووشەکانی ئەم ڕستە ئینگلیزییە: liberty intelligence our nations safety.

وە هیچ کەس ناتوانێت داواکاری پێشکەش بکات بۆ وەرگرتنی لە لیونز بەڵکو خۆیان کەسەکە هەڵبژێرن و دیاری ئەکەن و پێی ئەڵێن.

یانەکەی تر یانەی ( ڕۆتاری ) یە لقی هەیە لە زۆربەی وڵاتە عەرەبیەکان. وە ڕۆتاری وشەیەکی ئینگلیزییە بەواتای سوڕانەوە یان دوابەدوای یەك، لەبەر ئەوەی کۆبونەوەکان هەرجارەی لەماڵی یان نوسینگەی ئەندامێك دەبەسترێت بەنۆرە، وەئەمەش یەکێکە لەکۆمەڵەکانی ماسۆنی جیهانی پارێزەری ئەمەریکی بۆل هارس دایمەزراند لەشیکاغۆی ئەمەریکا ساڵی ١٩٠٥زا وەبڵاوبووەوە لەووڵاتانی جیهان لەوانەش میسرو ووڵاتانی عەرەبی.

****

پ٢٢: ووشە نهێنیەکانی ماسۆنی چی یە؟

وەڵام : ماسۆنی ووشەی نهێنی هەیە بۆ یەکترناسین لە نێوان ئەندامەکان بەکاری ئەهێنن لەوانەش ((بنیامین)) کە ئەوەش ناوی حەوتەمی یەعقوبە، وە ووشەی ((فالج)) ناوی کوڕی عابرە کە عیبرانیەکان سەر بە ئەون..

وە ووشەی ((ئوبیل )) ناوی پاشایەکە کەبە مەدینەدا تێپەڕیوە ((لە تەوراتدا هاتووە)) وە هێمای ڕزگاربونی بەنی ئیسرائیلی لەسەر ناوچەوانی خەڵکی داناوە.

وە(( زرو بابل )) سەرۆکی گەلی ئیسرائیلی وبەڕێوەبەری کاروبارەکانی لەکاتی دەرچونی لە بابل و گەڕانەوەی بۆ ئۆرشەلیم بۆ نوێ کردنەوەی مەملەکەتی جولەکە.

وەلێرەدا ووشەی ((بوعز)) کە ووشەیەکی نهێنیە لەنێوان ئەندامانی پلەی یەك لەماسۆنیدا. وە بوعز ناوی مێردی ڕاعوتە خاوەن گەشتەکە بەناوی خۆیەوەناوی ناوە لە تەوراتدا وەئەویش ((باوکی عوبێدو باوکی یەسی و باوکی داود ))ە، کە جولەکە باوەڕی

وایە لە ڕەچەڵەکی مەسیحی چاوەڕوانکراو لەدایك ئە بێت. وەهەروەها ووشەی ((جاکین)) کە ووشەیەکی نهێنییە لەنێوان ئەندامانی پلەی دوو. وەجاکین ناوی کۆتا پاشای ((یەهودایە)) کەپاشا ((بەخت نەسر)) بەدیل گرتی.

****

پ٢٣ : سوێندی پیرۆزی ماسۆنیزم چی یە؟

وەڵام : لەدەقی فێرکاری ماسۆنی (( گەورەترین ئەرك بۆ ماسۆنی ئەورووپی ئەوەیە بە ڕاگرتنی سەربەرزی ڕەگەزی جولەکەو پەرستنینیان، لەبەر ئەوەی پارێزگاری ئەکات لەئاستی ڕاگەیاندن بۆ ژیری و دانایی)).

وەماسۆن سوێندی پیرۆزی هەیە ئەڵێ: سوێند ئەخۆم بەئەندازیاری جیهانی گەورە((مەبەستیان حیرامە ئەندازیاری هەیکەلی سلێمان)) کەخیانەت نەکەم لەپەیمانی کۆمەڵە وە لە نهێنیەکانی نەبە قسە وەنەبە ئاماژە، وەهیچ شتێك نەنووسم لەبارەیەوە وەهیچ بلاَونەکەمەوە نەبە چاپکردن یان هەڵکۆڵین یان وێنە. وەڕازیم بەوەی لێوەکانم بەشیشی سورەوەکراو داخبکرێت وەهەردوو دەستم ببڕدرێتەوە وەلەملم بدرێت، وەلاشەکەم هەڵواسرێت لە ئەنجومەنی ماسۆنی بۆئەوەی داواکارێکی تر بمبینێت، وەلاشەکەم بسوتێنرێت وەخۆڵەمێشەکەی بدرێت بەدەم بایا بۆئەوەی هیچ شوێنەوارێك نەمێنێت لەتاوانەکەم.

هەروەها سوێندی ڕاستەوخۆش هەیە: ئەوەش ئەوسوێندەیە کە مرۆڤ ئەگەیەنێت بۆپلەی ماسۆنی پوختەکراوبێت لە هەموو ئەوانەی لە دەوریدان لە خزموکەس و ژن ومناڵ و کۆمەڵ، وەدەسبەسەر ئەکرێت لە هەموو جۆرەکانی دڵسۆزی یان پەیوەندی کردن جگە لە دڵسۆزی و باوەڕی تەواوی بێگەرد بۆ زانیاریەکانی ماسۆنی.

هاوڕێکەم ووتی: سوپاست ئەکەم زۆر شتت بۆمان ڕونکردەوە، هەروەها داوات لێئەکەم

کەبەردەوامبیت لە ڕوونکردنەوەدا وەتەواوکردنی باسەکە بە وەلام دانەوەی پرسیارەکانی تر:

****

پ٢٤: پلەکانی ماسۆنی وگرینگیەکانی چی یە لەجیهان؟

وەلام : بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە کە بزانین پلەکانی ماسۆنیزم جیاوازە بەپێی ڕێگای ماسۆنی لەجیهان، چونکەڕێگاکانی ماسۆنی پێنج ڕێگایە وەکو باسمانکرد ئەوانەش ڕێگای یورك کە شارێکە لەئینگلتەرا، کەپێك دێت لەسێ پلەی سەرەکی هەروەها پلەیەکی تری بەرز کەپلەیەکی زیادەیە، وە ڕێگای ئیسکتلەندی سەردەمی کۆن و پەسەندکراو کە لەفەرەنسا سەری هەلدا کە سی وسێ پلەی هەیە کەئەو ماسۆنیە ئەکاتە چوارپارچەوە ئەوانەش: ماسۆنی هێمایی بەناوبانگ(( شین )) وەماسۆنی سوارچاکی(( سوور))، وەماسۆنی فەلسەفی((رەش)) وەماسۆنی بەڕیوەبردنی((سپی)). وەڕێگای فەرەنسی نوێ، لەفەرەنسا سەری هەلدا کەلە ڕێگای ئێسکێتلەندی دەچێت لەڕوی فێرکاری وپەروەردەوە وە ئەمەش ماسۆنی نوێی هاوچەرخە.

وەڕێگای ئێسکتلەندی هەموارکراو وەئەمەش ماسۆنی مەسیحی یە. وەڕێگای سویدی کەبلاوبووەتەوە لە سویدو نەرویج و دانیمارك لە چوار بەش و دوانزە پلە پێکهاتووە.

وەبەناوبانگترین لەبەشەکان ماسۆنی((شین)) ٣٣پلەیە وە ( ماسۆنی فەرەنسی ئەیکۆسی ) ئەم بەشە لە وولاتەکانی عەرەبی بلاوبووەتەوە.

وەبەپێی ڕێگای ماسۆنی ئەیکوسی ٣٣پلە ئەنجومەنەکانیان پلەی ١ ـــ ٤ ی تەرخانکردووە بۆ ڕۆلەکانی ئەو وولاتانە کە داگیرکراوە لەلایەن وولاتە داگیرکەرەکان لە وولاتانی عەرەبی وولاتە هەژارەکان لە جیهانی سێیەم، وەئەوەش ئەو پلانەن کەزۆری لێنازانرێت لەئامانج وپلانەکانی ماسۆنی ڕاستەقینە، جگە لە برایەتی و یەکسانی و

سەربەستی نەبێت، بەڵام پلەکانی ٥ ــ ٣٣ تایبەت کراوە بۆ ڕۆڵەکانی وولاتە گەورەکان کە ئەنجومەنی شەیتانی ماسۆنی تیایە، وەئەبێت پلەیەك لەم پلانە ببەخشرێت بە ئەندامی ئەنجومەنێك لەوولاتەکانی جیهانی سێیەم لە کاتێکدا کەدەربڕی دڵسۆزە بۆ زایۆنیزم و ماسۆنی جولەکە، واتە ببێتە بەکرێگیراوی جولەکەو ناپاك بێت بۆ وولاتەکەی خۆی.

وە پلە کانی ئەم ئەنجومەنانە لە ١ ــ ١٢پلە دایە:

١ ــ دەسپێکەر یان ڕاهێنراو.

٢ ــ هاوڕێ یان کرێکار یان یاریدەدەر.

٣ ــ مامۆستا فێرکار.

٤ ــ مامۆستای نهێنی.

٥ ــ مامۆستای تەواو.

٦ ــ مامۆستای ڕازگری ڕاستگۆ (دەست پاکی باوەڕ پێکراو).

٧ ــ مامۆستای دادوەر و دادگاکان (سەرپەرشتیار ).

٨ ــ مامۆستای چاودێری بیناساز (دادوەر).

٩ ــ مامۆستای هەڵبژێردراو (هەڵبژاردەی باوەڕ ).

١٠ ــ مامۆستای هەڵبژاردەی سەرکەوتوو لەپانزەدا.

١١ ــ مامۆستای سوارچاکی هەڵبژاردەی گەورە (گەورەی دوانزە هۆزەکە).

١٢ ــ مامۆستای ئەندازیاری گەورە (ئەندازیار).

١٣ ــ پردی پاشایی .

١٤ ــ هەڵبژاردەی گەورە لەپلەی ١٥ ــ ١٨ (هەڵبژێردراوی پێشوی گەورە).

١٥ ــ سوارچاکی ڕۆژ هەلات هاوەڵی شمشێر (سوارچاکی شمشێر).

١٦ ــ پاشای ماڵی پیرۆز.

١٧ ــ سوارچاکی خۆرهەلات و خۆرئاوا.

١٨ ـ سوارچاكی خاچی پەمەیی یان سوارچاكی دانا.

بەمشێوەیە نـاوو نازنـاو بـەردەوام دەبێـت تـاكو پلـەی ٣٣ وەنـاوی پلـەكان ئـەگۆڕێن لەنێوان كۆمەلەكانی ماسۆنی لەجیهاندا بە گوێرەی هەر وولاتێك.

وەپلەكانی ١ ــ١٨ پلەی ڕووكەشین مەبەستیان بۆئەوەیە پلە بدرێت بەماسۆنی هەنگاو هەنگاو هەتا ماسۆنی ناچاربێت بە گوێڕایەڵی كردنیان بۆئەوەی بەرز بكرێتەوە.

پلەبەرزەكانی ماسۆنی لە جۆرەها زانست و هونەر و فەلسەفە و هەندێك لە دابونـەرێتی ئەسپ سواری كۆن كۆدەبێتەوە وەئەمـەش یارمـەتی دەرە بـۆ گەیشتنی ماسـۆنی بۆپلـە بەرزەكان.

وە ماسۆنی لە پلەكانی ١ ــ ٣ هیچ شتێك نازانن لە ئامانجـە ڕاسـتەقینەكانی ماسـۆنی، چونكە هیچ نهێنیەكی ڕاستەقینەیان پێ ناناسێنن هەتا دڵنیا نـەبن لـە دڵسـۆزیان بـۆ ئـەو ماسۆنیانەی بوونە بەجولەكە.

وەناوەكانی پلەكان لە ١٩ ــ ٣٣ ئەمانەن:

١٩ ـ دادوەری گەورە.

٢٠ ـ بەتریكی گەورە.

٢١ ـ مامۆستای گەورە بۆكلیلی بینا.

٢٢ ـ سوارچاكی تەوری پاشایەتی.

٢٣ ـ پاشای گەورەی هاوپەیمان.

٢٤ ـ سەركردەی دوو هەڵۆ ڕەشەكە.

٢٥ ـ سەركردەی نهێنی پاشایەتی.

٢٦ ـ شازادەی بەزەیی.

٢٧ ـ سەركردەی پەرستگای بالا.

٢٨ ـ سوارچاکی خۆر.

٢٩ ـ سوار چاکی ئیکۆسی.

٣٠ ـ سواچاکی هەڵبژاردەی گەورە.

٣١ ـ سەرکردەی سەرپەرشتیاری لێکۆڵەری گەورە.

٣٢ ـ شازادەی بەناوبانگ بۆنهێنی پاشایەتی.

٣٣ ـ سەرپەرشتیاری گشتی گەورەی باڵا.

****

پ٢٥ : پێمی ووت : سوپاست ئەکەم بۆ وەڵامدانەوەت هەرچەند نەختێك درێژ بوو، بەڵام هەستمکرد کە کورتتکردەوەو بەگوێرەی توانا، وەبۆ تەواو کردنی ئەوەی باستکرد ئەپرسم:

هێمای ماسۆنی چی یە؟

ماسۆنی جۆرەها هێمای هەیە بەناوبانگترینیان پرگالەکەو راستەی ئەندازەییەکەیە.

وەئەم هێمایەش دوو واتای هەیە:

واتایەکی ساکار کە مەبستی پیشەی بەننایە.

وەواتای شاراوەی مەبەست لە پەیوەندی دروستکاروو دروستکراوەوەیە، کە هێمایە بۆ دووگۆشەی بەرامبەر: یەکەمیان ئامارژەیە بەئاراستەی لە خوارەوە بۆ سەرەوە وەهێمایە بۆ پەیوەندی زەوی بە ئاسمانەوە، وەدووەمیان لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئامارژەیە بۆ پەیوەندی ئاسمان بە زەویەوە .وەئەستێرەی داوود هەمان مەبەستی هەیە کە هێمایە بۆ یەککگرتنی پەریەکانی (ئاسمان) لەگەڵ پیاوەکانی وولآت ( زەوی ) ئەوەبوو کەداود

بەدیهێنا لەکاتی فەرمانڕەوایی کاتێک سەرچاوەی فەرمانی دامەزراند کەپشتی پێ ئەبەستێت بەپاڵپشتی کاهینەکانی جولەکە.

لەنێوان گۆشەی وەستاو پرگالدا پیتی G ئەبینین، ماسۆنیەکان ڕای جیاوازیان هەیە بەشێکیان بە یەکەم پیتی خودای گەورە ( God)ی دائەنێن ، وەبەشێکی تریان بڕوایان وایە کەیەکەم پیتی ووشەی ئەندازەیە(Geometry)، وەهەندێکی تریان شیکاری قوڵتری بۆ ئەکەن وەئەڵێن پیتی G سەرچاوەکەی ووشەی (Gematria)، کەئەمەش ٣٢ یاسایە کە شوێنەوار ناسانی جولەکە دایناوە بۆ ڕاڤەکردنی پەرتوکی پیرۆز ساڵی ٢٠٠ پێش زاینی.

وە لە ڕوی ڕێکخستنەوە چەندەها دەستەی بەڕێوەبەری بڵاوبووەتەوە لەجیهان، وە ئەم دەستانە لەوانەیە پەیوەندیان لەگەڵ یەکتر هەبێت یان نەبێت، وەدڵنیا نەبونی ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو نهێنیەی کە چواردەوری هەیکەلی ڕێکخستنی ناوخۆی ماسۆنی داوە بەلاَم لەساڵەکانی کۆتادا بزوتنەوەکە دەستی کرد بە شێوازێك بەوە وەسفەکرێ کەمتر نهێنی بێت. وەماسۆنیەکان وای دائانێن کە نهێنی یان شاراوە بێت دەربارەی ڕێ وڕەسمی بزوتنەوەکە و چۆنیەتی جیاوازی ئەندامەکانی تر لە ڕێکخستندا، لەڕاستیدا بۆچونێکە بۆ پابەندبوون بە پەیمان ودڵسۆزی بۆ بزوتنەوەکە کە دامەزرێنەرە سەرەتاکان دەستیان پێکرد وە ئەوکانی دوای خۆی هەر بەوشێوازەیان برد.

ماسۆنیەکان زۆر ووشەی (( ئەندازیاری گەورەی جیهان )) دوبارە ئەکەنەوە کەمەبەستیان خوایە، بەلاَم بە شێکیان ئەیگێرنەوە بۆ((حیرام ئەبیف)) ئەندازیاری هەیکەلی سلیمان، وەبەشێکیتریان پیتی G بەهەسارەی زەهرە ئەنوێنن، وەبەلای ئەوان هەسارەی زەهرە نوێنەرایەتی ئەندامی نێرینەی پیاو ئەکات، وەهەروەها یەکێکە لەناوەکانی شەیتان وە لەلای ماسۆنیەکان خوای (( بافومیت)) ئەگەیەنێت ( ئەو خوایەی کەسوارچاکی هەیکەل تاوانبار کرا بەپەرستنی بەنهێنی لەلایەن فیلیب ی چوارەم پاشای

هەرمسا، وەئەویش لاشەی شەیتانە(لوسیفەر) پەری ڕووناکی دەرکراو لە بەهەشت).

****

پ٣٦: دەستووری ماسۆنی چی یەو کێ نووسیویەتی؟

وەلام: لەساڵی ١٧٢٣ جیمس ئەندرسۆن( ١٦٧٩ ــ ١٧٣٩ ) دەستووری ماسۆنی نووسییەوە، وەئەندرسۆن ماسۆنی بوو زیانی بە چالاکوان دەستی پێکرد لەکەنیسەی ئیسکتلەندا. وەبنجامین فرانکلین دوای ١١ساڵ هەستا بە دووبارە چاپکردنەوەی دەستوور لەساڵی ١٧٣٤ دوای هەڵبژاردنی فرانکلین بە سەرۆکی ڕێکخراوی ماسۆنی لە لقی بنسلفانیا، وەفرانکلین نوێنەرایەتی دەستەیەکی نوێی ئەکرد لەماسۆنیدا، وە ئەم دەستەیەش ژمارەیەك لە ئامەتکی نوێی زیادکرد بۆ مەراسیمی پەیوەندی کردن بۆ بزوتنەوەکە وە پلەی سێیەمی زیادکرد وەئەویش پلەی ماستەرە بۆ دووپلە کۆنکەی تر، دەسپێکەر وە خاوەن پیشە.

ئەوەی شایەنی باسە کە چاپی ئەسڵیەکە بۆ دەستووری ماسۆنی کە ئەندرسۆن نووسیویەتی ساڵی ١٧٢٣ وەدووبارە فرانکلین چاپیکردەوە ساڵی ١٧٣٤ پێکهاتبوو لە ٤٠ پەڕە لەمێژووی ماسۆنی لەسەردەمی ئادەم، نوح،ئیبراهیم، مووسا،سلێمان سەلامی خوایان لێبێت، ئەبو خوز نەسر، یولیوس قەیسەر، تاکو پاشا جیمسی یەکەم لە ئینگلتەرا وەلە دەستورەکەشدا بەدرێژی باسی حەوت سەرسوڕهێنەرەکەی جیهانی تیایە وەبەدەسکەوتی ڕاستی ئەندازە ئەژمێردرێت وەلەدەستورەکەدا زانیاری و کاروباری ڕێکستی بزوتنەوەکەی تیایە، وەهەروەها پێنج گۆرانی تیایەو ئەبێ ئەندامان بیڵێن لەکاتی بەستنی کۆبوونەوەکانیدا.

دەستوور ئاماژە ئەدا کە ماسۆنی بە شێوەی ڕۆژئاوایی سەردەمیانەیدا برەوپێدانە بۆ سەردەمی کۆن لە کتێبی پیرۆز، وەئەوجولەکانەی میسریان جێهێشت لەگەڵ مووسادا

یەکەم وولاتیان بۆ ماسۆنیەکان بنیاتنا وەمووسا ـ کەخۆیان ئەڵێن ـ زانای ماسۆنی گەورە بوو وە هەندێ وتەوباس هەیە کەمەسیح ی دەججال خۆی سەرکردەیە، وەلەبەر ئەوە یەك چاو هەیە لە هەموو دروشمەکانی وەهەروەها ئەڵێن:کە گوایە( سامری ) ە وەئەویش خۆی بە فیرقەی سیانزەیەمی ونبووی ( ئەسبات ) ئەژمێرێت.

وەهەروەك ووتمان بنجامین فرانکلین هەستا بەدووبارە چاپکردنەوەی دەستووری ماسۆنی ساڵی ١٧٣٤.

****



بنیامین فرانکلین یەکێك لەباوکانی دامەزرێنەران لەو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە دووبارە دەستوری ماسۆنی چاپکردەوە.





پلیکانەی ماسۆنی کە ئەندام بەرز
ئەکاتەوە لە ئەنجومەنی ماسۆنی بۆ
بەرزترین پلە.

مەداليا و هێماكانی ماسۆنی و پلەكانی






دروشمی ((دبوس)) بۆ هەر كێیەك ببێتە ئەندامی ماسۆنی ڕۆتاری



بارەگای ئەنجومەنی ماسۆنی گەورە ــ لەندەن



# بیروباوەڕ و ئاهەنگەکانی ماسۆن

ـ گرنگترین بیروباوەڕو ئاهەنگەکانی ماسۆنی چی یە ؟

ـ مەرجەکانی ئەندامێتی و چونە ناو ماسۆنیەوە.

ـ تەرخانکردنی ئەندام لەئەنجومەنی ماسۆنی.

ـ پلە یەکەمەکان لە پلیکانەی ملب[illegible]

هاوڕێکەم پێمی ووت: ئێنەگەم لەوەی کەماسۆنی بنەماو ئاهەنگی پەرستنی هەیە بەر ئاینەکان، ئەمەڕێ شارەزایم هەبێ لەسەرێ وەپرسیارەکەشم ئەمەیە:

پ٢٧: گرنگترین بنەماو ڕێکاکانی ماسۆنی چی یە؟

وەلام : ماسۆنیەکان بزوتنەوەکەیان بەکۆمەڵێک لە بنچینەوەی پەرستنەوە دەست دەکەن وەکو خۆشەویستی برایەتی و ڕاستی و سەربەستی و یەکسانی، وەهەموو ماسۆنیەکان جێبەجێکردنی ئەم بیروباوەڕە لە شێوەی ئاهەنگدا ئەندام پێی بەر ئەبێتەوە لەپلەی دەسپێکەرەوە بۆ پلەی مامۆستا، وەپلە پێدان بەپێی توانی ئەندامەکەیە لەسەر هەستکردنی ڕاستی خۆی و وەفاو جێبەجێی فەرمودەی ئەو پێی وەپەیوەندی بە دامەزرێنەری گەورە کەباوەڕی پێیەتی وە بەرچاوکردنی ئەو ئینەی کەباوەڕی پێیەتی ئەندام.

زۆرێک لە شاراوەیی هەیەسەبارەت بە هێماو ئاهەنگ و هەڵسوکەوتی ماسۆنی، وەئە ساڵەکانی کۆتاییدا سەرکردەکانی ماسۆنی هەستیان کرد کە ئەم هەموو شتانەیە لەبەرژەوەندی ماسۆنی نیە،وەئەو نهێنیەی کە پێویست بوو لەسەرەتاکانی بزوتنەوەکە بەکارهێنرا بۆ بلاوکردنەوەی زۆرلەبیروبۆچونەکانی پیلانەکان لە سەر بزوتنەوەکە وەبزوتنەوەکە هەستا بە بانگێشکردنی ڕۆژنامەکان و تەلەفزیۆن بۆئەوەی ئامادەی لەکاروبارە شاراوەکان، وە وێنەگرتنی هەندێک لەدانیشتنەکان بەلام ڕێیان نەدا بە ڕاگەیەندنەکان بەوێنەگرتن وبینینی دانیشتنەکانی پشتپەردەی ئەندامەکان.

بەپاڵپشتی ماسۆنیەکان، ئاهەنگە بەدیهاتووەکان کەهەندێک کەس بەترسناک پێی دەکات تەنها هێمایەکە بیناسازە کۆنەکان بەکاریان هێناوە لەسەدەکانی ناوەڕاست وەپەیوەندی هەیە بە هونەری تەلار و ئەندازەوە.

گۆشەی وەستاو و پرگال لەگرنگترین هێماکانی ماسۆنین، وە ئەم هێمایانەش ئەمەوێ

ڕەمز و پەیکەرەکانی ماسۆنی هەن بەتەنیشت کتابی پیرۆزەوە کەبنکەکە پەیرەوی دەکات وەکانی باوەڕ پێکردنی ئەندامی نوێ ماڵی ئەدرێتێ کەهەر کتابێکی ئاسمانی هەڵبژێرێ وە ئەمو کاتەدا بەپیرۆزی دابنێت.

ماسۆنیەکان هەندێ هێمای نهێنی بەکاردێنن بۆئەوەی بەهۆی ئەوەوە ئەندامی ڕێکخراوەکان یەکتری بناسن، وەئەم هێمایانەش جیاوازن لەبنکەیەکەوە بۆبنکەیەکی تر. لەسەدادەکانی دواییدا کەناڵی جەزیرەی ئاسمانی لەیەکێك لەبەرنامەکانی هەستا بەپیشاندانی فیلمێك تیایدا لێکچوونی ئامەنگی باوەڕ پێکردنی ئەندامێکی نوێ لە ماسۆنی، کەناڵەکە سەرۆکایەتی بەڵگەنامەیی بەسەرچاوەی باوەڕپێکراو دەکرد لەناو ڕێکخراوی ماسۆنی دا، وەلەم دیمەنانەدا ئەتوانین دیمەنێك ببینین کەلەلایەن کەناڵێك وەپەخش دەکرا((سەرۆکی گەورە)) داوای دەکرد لەئەندامێکی نوێ کەلەسەر ئەژنۆکانی بچۆك دابنیشێت وەلەدوای((سەرۆکی گەورە)) ئەم وتانە بڵێتەوە:

((ئەی خوای دەسەڵاتدار بەسەر هەموو شتێك، زاڵی بەسەر بەندەکانتا، لەژێر چاودێری خۆت خۆشی بڕژێنە بەسەرماندا، وەئەم ئامادەبوانە شکۆدار بکەیت وەبەندەی خۆت سەرکەوتووبکەیت ـ ئەم داواکارە ـ بەچوونی بۆناو هۆزی بیناسازە ئازادکارەکان، بۆئەوەی سەرجەمی ژیانی لە گوێڕایەڵی کردنتدا، بۆئەوەی برایەکی دڵسۆزی ڕاستیمان هەبێ.. ئامین))

وەلەدوای کۆمەڵێ لەپەیماندان بەئامادەبوونی کۆبونەوەکان وەپارێزگاری لەسەر نهێنی ڕێزنانەوەکە بەگوێرەی کەناڵی جەزیرەی ئاسمانی، (( سەرۆکی گەورە )) ئەم وشانە دەڵێ:

((ئێستاش چۆك دابدە لەسەر ئەژنۆی ڕاستت، پێی چەپت چوارگۆشەیەك دروستبکات، دەستی چەپیشت بەرەو ژوورێ بە دەستی ڕاستیشت ئەم پرگاڵە بگرە، وەنوکەکانی بۆلای دەستی ڕاستت ببە وەلەدوامەوە بڵێ: خوایە خۆت دامەزراوم بکە، وەبەردەوامم بکە

لەسەر ئەم سوێندە گەورەیە وەبەردەوام پابەندم لەسەر ئەم سوێندە گەورەیە)).

وەلەدوای سوێند خواردن ـ مەبەستی کەشتی جەزیرە ـ ((سەرۆکی گەورە)) داواکان لە ئەندامەکە بەماچکردنی کتابە ئاسمانییەکە ئەندامەکە پیرۆزە لای ((سەرۆکی گەورە)) هەڵاسێ بە هەڕەشەکردن لەئەندامەکە بەوەی کە(( تووشی لێدان و کوشتن ئەبێت ئەگەر ویستت ڕابکەیت لە ڕیزەکانی ڕێکخراوەکە )).

ماسۆنی خۆی بەئاینێک نازانێت یان بەبیروباوەڕێک لەبری ئاین، فیکرەی بۆچوونی ماسۆنی دەربارەی بنیاتنەری گەورە هاوجووتە بۆئاینە ئاسمانییە یەکگرتووە سەرەکییەکان بەگوێرەی فیکرەی ماسۆنی ئەندام ئازادە لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕ، کەواتە جیاوازییەک بۆی بە باوەڕهێنانی بەبنیاتنەری گەورە بەرەچاوکردنی ئەو ئاینەی کەتاک باوەڕی پێئەهێنێ، وەئەندام وەردەگیرێت لەدەرەوەی ئەوئاینانەی کە بەئاینە یەکگرتووەکان دادەنرێت وەک بوزی و هیندۆسی.

ماسۆنییەکان سوورن لەسەر ئەوەی ئەندامێتی ئەو کەسانە پەسەند ناکەن کە هەڵگەڕاوەن لە ئاینێکی دیاریکراو وە کەس هان نادەن بۆشوێن کەوتنی ئاینێکی دیاریکراو. وەلەماسۆنی دا ڕێگای ڕزگاربوون یان دەرچوون نیە کەلەناو هەندێ ئاینەکانی تردا هەیە، وەهەندێک ڕەخنە دەگرن بەبەکارهێنانی ماسۆنییەکان بەووشەی ((worshipful)) لەکاتی گفتوگۆ کردنیان لەگەڵ ماسۆنییەک هەڵگری پلەی ماستەر بێت، وە وەرگێڕانی پیتی ئەم ووشەیەش وتا (( پەرستراو )) بەلام ماسۆنییەکان دووپاتی دەکەنەوە کەبەکارهێنانی ئەم نازناوە ئەگەڕێتەوە بۆشێوازی زمانی ئینگلیزی کۆن کە ئەم ووشەیە بەکاردەهێنرا بۆ ڕێزگرتن بەواتای (( بەڕێزتان)). هەندێک لەوانەی ماسۆنی تاوانبار دەکەن بەوەی کەڕکابەریتی فیکرەی ئاینی دەکەن وەفیکرەی عیلمانی بڵاو دەکەنەوە بەلام دەستور یان یاساکانی بنچینەی ماسۆنی کەلەساڵی ١٧٢٣ چاپکراوە ئەڵێ: ماسۆنی نابێ هەرگیز (( بێباوەڕیەکی گێل بێت )) وەلەدەستوردا بڕگەیەک هەیە

بەدیاریکراوی: کەنابێت بێباوەڕ وەربگیرێت وەك ئەندامێکی نوێ وە ئەم مشتومڕە تەما ساڵی ١٨٧٧ لەفەرەنسا کاتێك لقی فەرەنسی مەستا بە سڕینەوەی ئەم دەستەواژەیە لەدەستوور وەدەستیکرد بە وەرگرتنی بێباوەڕەکان لەریزەکانی خۆی وەدوابەدوای ئەمیش لقی فەرەنسی مەستا بەسڕینەوەی ئەم برگەیە، وەئەمەش دابەشبونێکی خستە نێوان لقی بەریتانی وفەرەنسی بەلأم لە ١٣یتشرینی دووەمی ١٨٨٩یەکێك لەسەرگەورەی ماسۆنیەکان لە ئەریزۆنا ی وولأتە یەککگرتووەکان بریاریدا کە ئەندام ئەتوانێت باوەڕبهێنێت بەبۆچونی جۆراوجۆر بۆ (دروستکاری گەورە) وەهیچ زیانێکی نییەلەو بۆچونەی کەدروستکاری گەورە بریتیە لە فیکرەو تێگەیشتنێك لەئاستێکی بەرزدا کە مرۆڤ بۆخۆی دروستی بکات.

وە لەچوارچێوەیەکیتردا کۆمەڵەی فیقهی سەربە یەککگرتوی ئیسلامی جیهانی بەیانێکی دەرکرد تیایدا هاتووە:

((ئەندامانی کۆمەڵگە مەستان بە لێکۆڵینەوەیەکی تەواو لەسەر ئەم رێکخراوە ترسناکە، وەپیاچونەوەیان بۆکرد لەوەی کەنووسرابوو دەربارەی لەکۆن ونوێ، وەلەوەی کە بلأوکرابوەوەلە بەڵگە نامەکانیان لەوەی کەنوسرابوو وەبلأوکرابووەوە لەلایەن ئەندامەکانیانەوە، وەهەندێك لەکۆکراوەکانیان لە نووسینەکانیان، وەلە بابەتەکانی گۆڤارەکانیان کەبەزمانی ئەوانەوە قسەدەکات.

ـ وەڕوون بوەوە بۆ گشتی بەشێوەیەك کەهیچ شك و گومانێك قبولْ ناکات لەکۆی ئەوەی کەپیایدا چووەتەوە لە نووسراوەکان و دەقەکان بەم شێوەیەی خوارەوە:

١ـ ماسۆنی رێکخراوێکی نهێنیە رێکخستنەکانی جارێك ئەشارێتەوەو جارێك ئاشکرای ئەکات، بەگوێرەی بارودۆخی کات و سات، بەلأم بیروباوەڕی ڕاستەقینەکەی نهێنیە لەهەموو بارودۆخێکدا زانیاریەکانیان داپۆشراون هەتا لەلای ئەندامەکانیان، تەنها تایبەتەکان ئەوتایبەتانەی کەوا ئەگەنە تاقیکردنەوەیەکی زۆر بۆ پلە بەرزەکان.

٢ ـ پەیوەندی بنیات ئەنێ لەنێوان ئەندامەکانیان لە هەموو بەشێکی زەوی لەسەر بنچینەیەکی ئاشکرا، وەئەوەش برایەتیەکی مرۆڤایەتیە بۆگەورەیی نێوان هەموو ئەو هاتووانەی ناو ڕێخستنەکانی بەبێ جیاوازی نێوان جۆرەها بیرباوەڕوو مەزهەبەکان.

٣ ـ کەسانێك ڕائەکێشن کەمەبەستیانبێت بۆناوڕێخستنەکەیان بەڕێگای هەڵخەڵەتاندن بەسوودگەیاندی کەسێتی، گوایە هەربرایەکی ماسۆنی سەربازە لەپەنای هەربرایەکی ماسۆنی تردا، لەسەر هەر پارچەیەك لەپارچەکانی زەوی، هاوکاری ئەکات لە پێداویستیەکانی وئامانجەکانی و تەنگوچەڵمەکانی، وە پشتگیری ئەکات لەئامانجەکانی ئەگەر سیاسیبێت وەپشتیوانی ئەکات ئەگەر کەوتە کێشەیەکەوە لەکێشەکان هەرچییەك بێت گوایە هاوکاریکردنەکەی بۆ هەقە نەك بۆناهەقی، وەئەمەش گەورەترین لەخشتەبردنە کەخەڵکی پێ ڕاو ئەکەن لەجۆرەها ناوەندە کۆمەڵایەتیەکان وە ئابونەشی لێوەردەگرن.

٤ ـ چونە ناو لەسەر شێوەی ئاهەنگ دەبێت لەوەرگرتنی ئەندامی نوێ لەژێر مەراسیم وشێوەکانی هێمای تۆقێنەر بۆترساندنی ئەندامەکە ئەگەر ڕێنماییەکان و فەرمانە کانی پێشێل کرد.

٥ ـ واز لە ئەندامە گێلەکان بۆخۆیان هەر پەرستنی ئاینی خۆیان بکەن وەڕاینەسپێرن بەو کارانەی کەلەتوانایاندایەو وەلەپلەی دونیادا دەمێننەوە، بەڵام بێبڕواکان یان ئەوانەی ئامادەن بۆ بێبڕوابوون پلەکانیان بەرزدەبێتەوە لەڕێگای تاقیکردنەوەکانی چەندجارەی ئەندامەکە وەبەگوێرەی ئامادەییان بەخزمەتکردنی پیلان وبیروباوەڕەترسناکەکانیان.

٦ ـ ئامانجێکی رامیاری هەیە وە شوێن پەنجەی دیارە لەزۆربەی کودەتای سەربازی و رامیاری و گۆڕانکاری ترسناکەکان بەناشکراونهێنی.

٧ ـ لە سەرەکی و بنچینەی ڕێکخستنیدا ڕەگی جولەکەیی و بەڕێوەبەری باڵای جیهانی جولەکیی نهێنی و چالاکی زایۆنیزمیە.

٨ ـ لەئامانجە راستی و نهێنییەکەیدا دژی گشت ئاینەکانی بۆ لەناوبردنی بەتایبەتی،
وەلەناوبردنی موسوڵمان بەتایبەتی.

٩ ـ سوورە لەسەر هەڵبژاردنی ئەندامانێك كە پلەو پایەی دیاری یان رامیاری یان
كۆمەڵایەتی یان زانستی یان هەر پلەیەك كە بتوانن كۆمەڵگە (ئەوان قەزای) بكەن
لەكۆمەڵگەكەیان، وە لایان گرنگ نیە بە ئەندام بوونی یەكێك پایەیەكیان نەبێ كەبتوانێ
قۆرخی بكەن، وەلەبەر ئەوە زۆر لەوریاداری پاشاو سەرۆكەكان و فەرمانبەرە بەرزەكانی
وڵات و هاوشێوەیانن.

١٠ ـ چەند لقێكی لێدەبێتەوەو ناوی تر لەخۆدەگرێت بۆئامادەكاری و گەڕاندنی
ئاگاداركردنەوە بۆئەوەی بتوانێت لەچالاكیەكانی بەردەوامبێت لەبەرزۆر ناوێتی لەگەڵ
بەرەنگاری ناوێكی ماسۆنی بێت لە چوارچێوەیكدا، وەئەو لقانەش بەردە پارێزراوە
بەناوی جۆراو جۆر گرنگترینیان رێكخراوی رۆتاری و لیونز، جگە لەمانەش لە بیروباوەڕو
چالاكیە پیسەكانیان كەوا بەكناكرن بەگشتی لەگەڵ بنەماكانی ئیسلام وە پێچەوانەی
پێچەوانەیەكی گشتیە.

****

پ٢٨: مەرجەكانی ئەندامێتی بۆئەندامبوون بەماسۆنی چی یە؟

وەڵام : لەساڵی ١٨٧٧ كاتێك كە ئەنجومەنی ماسۆنی لە فەرەنسا دەستی كردبە
وەرگرتنی ئەندامانی بێباوەڕان و ئافرەتان بۆ ڕیزەكانی بزوتنەوەكە وە ئەم جیاوازیە
جۆرێك لە لەتبوونی بەجێهێشت لەنێوان ئەنجومەنی فەرەنساو بەریتانیا،

وەئەم جیاوازیەش سەرچاوەكەی شێكاری جیاوازی هەیە لەلایەن دوولقەكە دەربارەی
دەستووری ماسۆنی كەساڵی ١٧٢٣ نووسرا كەئەمەش دەقەكەیەتی ((نابێت ماسۆنی
بێباوەڕێكی گێل بێت )).

لەساڵی ١٨١٥ ئەنجومەنی سەرەکی ماسۆنی لە بەریتانیا دەقێکی زیادکرد بۆدەستور کەرێگە ئەدرێت بەئەندام پەیڕەوی هەرئاینێك بکات کە لەگەڵی ئەگونجێت وەباسی دروستکەری گەورەی جیهانی تیایە، وەدوای ٣٤ساڵ لقی فەرەنسی هەستا بە هەمان هەموارکردنەوە، وەلەساڵی ١٨٧٧ گۆڕانکاریەکی پیشەیی کرا لە دەستووری ماسۆنی کەساڵی ١٧٢٣ نوسراوە وەگۆڕانکاری کرا لە هەندێ لەمەراسیمەکانی پیوەندیکردن بە بزووتنەوەکە بەجۆرێك کە رێگای ئاینێکی دیاریکراو بگرێت وەهەر ئەندامێك ئازادە لە هۆگربونی ئەوەی ئەیەوێت بەمەرجێ باوەری بە بوونی دروستکەری گەورەی گەردوون هەبێت،

بۆئەوەی کەسێك ببێتە ئەندام لە رێکخراوی ماسۆنی پێویستە لەسەری داواکاریەك پێشکەش بکات بەلقێك لە ئەنجومەن لەو ناوچەیەی کەلێی نیشتەجێیە وە وەرگرتنی کەسەکە یان وەرنەگرتنی بەدەنگدانی نێوان ئەندامەکانی ئەو ئەنجومەنە دەبێت. دەنگدان لەسەر دوو کاغەز دەبێت، بۆوەرگرتنی کاغەزی سپیە وەبۆوەرنەگرتنی کاغەزی رەشە، وەلەبنکەیەکەوە بۆبنکەیەکیتر ئەگۆڕدرێت، وەلەهەندێ بارەگا یەك دەنگی نەخێر بەسە بۆ وەرنەگرتنی کەسێك بەئەندام.

## لە مەرجەکانی وەرگرتن لە رێکخراوەکە:

- ئەبێ پیاوێکی ئازادبێت.
- ئەبێت بڕوای بەبوونی دروستکەری بالا هەبێت بەرەچاوکردنی لە ئاینی کەسێك، بەلام ئەنجومەنی وا هەیە لەرێکخراوەکە وەك ئەوەی سوید تەنها ئەوئەندامانە وەرئەگرێت کە باوەریان بە ئاینی مەسیحە.

- ئەبێت تەمەنی ١٨ ساڵان بێت وە لە هەندێ بارەگا ٢١ ساڵ.
- ئەبێت تەندروست بێت لەرووی جەستەو هۆش و رەوشتەوە وەناوو ناوبانگی پاکی هەبێت.

ـ ئەبێت ئازادبێت نەك ڕاسپێردراو بێت.

ـ ئەبێت ئەستۆ پاكی لەلایەن دوو كەسی ماسۆنیەوەبێت بەلایەنی كەمەوە.

ـ ئەبێت هەڵگری ئارناوی زانكۆ بێت بەلایەنی كەمەوە.

ـ ئەندامانی ڕێكخراوی ماسۆنی سوورن لەسەر ئەوەی ماسۆنی بریتینیە لە ئاین و لەبری ئاینیش نیە.

****

هاوڕێكەم ووتی: سوپاسم بۆت دووبارە ئەكەمەوە، وەئێستاش حەزئەكەم شتێك بزانم لەدرێژەی ئەوەی ڕوئەدات لە ئەنجومەن یان هەیكەلی ماسۆنی لە ئاهەنگی تەرخانكردن یان دانان و بەرزكردنەوەی ئەندامان لەڕێی پلەكانی ماسۆنی، وەپرسیارەكەش ئەوەیە:

پ٢٩: ئاهەنگی ماسۆنی یان ئەوەی پێی ئەڵێن تەرخانكردنی ئەندامان لەپلەكانی ماسۆنی جۆرلوجۆر چییە؟

وەڵام: هەموو هێماو تەلەسمەكانی ماسۆنی كارێكی سوك و ئاسان نیە لەبەردوو هۆ:

یەكەمیان: كەمی بەڵگەنامەو سەرچاوە.

دووەمیان: لەبەرئەوەی ڕێكخراوەكانی نهێنی زایۆنی ئەگۆڕدرێت وەچینێك لە ڕووداوەكانی هەر سەدەو زروفێك دروست ئەبێت لەهەر بارودۆخێكدا، وەگەشەكرنی نوێ شێوەیەك بەخۆوە ئەبینێت كە زەحمەتە بەستنەوەی نێوانیان وەهەروەها نیازی شاردنەوەی ڕاستی نیازەكانیانە.

لەو چوارچێوەی كە گەورە ماسۆنیەكان خۆیان نوسیویانە دەربارەی كۆمەڵەكانیان وەك شاهین مكاریوس كە ماموستای گەورەیە لەماسۆنی وەپلەی ٣٣ی بەدەسهێناوە

وەجگە لەویش، ئەڵێن کە ماسۆنی مێژووی درووستبونی ئەگەڕێتەوە بۆ ئادەم و پێغەمبەران، وەکۆبونەوەکانی دامەزراندن تۆماردەکەن لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ڕۆمانی دوای بەرزبونەوەی مەسیح سەلامی خوای لێبێت، وە ئەوکاتە ماسۆنی ناوی هێزی شاراوەبوو. وەلەو دەقانە لەدەقێك هاتووە: ((ئەی برایانی شاراوە سەرۆك و ئەندامانی هەیکەلەکان کە کارنەکەن لەکۆمەڵەی هێزی نهێنی. کاتێك کە کۆمەڵەکەمان لەسەردەمی کۆن مێژووی دروستبوونی ڕوون نیە،وەهەمووان بەبێشك ئەمانەوێت ئەو نهێنیە بزانین بەلام بۆ بەد بەختی ئەستەمە بۆمان کەهەروەك بۆ باووباپیرانمان ئەستەم بوو وەئەوەی بەردەست لێمە کەوتووە ئەوەیە کە بەڵگەیەکە لەناو کاغەزەکانی پاش هیردۆس ئەکرییا سەرۆکی هەیکەلی پێشومان ئەمەش دەقەکەیە:(( حیرام ئەندازیاری هەیکەلی سولێمان پلەو پایەکەی لەلایەن گەورەکەیەوەبوو، چاکەیەکی گەورەی هەبوولە ئەندازیاری و دامەزراندن وڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کارەکانی بەپێویستمان زانی کەپلەی سێیەم لەپلەکانی کۆمەڵەکە بەناریەوەبێت واتە(( پلەی مامۆستا حیرام )) ((وە تاسەر بەردەوامبێت ))،

وەلەگەڵ ئەوەشدا وێنەی ئەم بەڵگەیە مۆرنەکراوە بۆیە بە پێویستمانزانی کە پابەندبین پێوەی ، وەکارکردن بە ویستی خاوەن ئەم فەرمانە هەرکێیەك بێت فەرمان ئەدەین پلەی سێیەم بەناوی حیرام ناوبلرێت لەئێستاوە بەرەوژوور.

وەکاتێك وامانئەزانی کەئەبێت بونی ڕێ ورەسمی ئاهەنگ ئەبێت پابەندبین پێوەی لەکاتی بەخشینی ئەم پلەیە، بۆیەد بەختی دەقێکمان ئەدۆزیەوە وەئێمە بەیارمەتی براپێشینیەستووەکانی هەیکەلی سەرەکی دامانئنا کەئەبێت پابەندبین پێیەوە وەلەویاسایانەی دامانئنا ئەمانەن:

یەکەم: لەهەرهەیکەلێکدا ژوورێکی زۆربچوك تەرخانئەکرێت کە ڕۆشنی تیانەبێت وە برایەکی پلەدوو دێلن چاوەکانی بەستراوەتەوە پێش ئەوەی بچێتە هەیکەلەکە چاوی

ئەکەنەوەو دەرگاکە دائەخەن، ئنجا تابوتێک ئامادە ئەکەن و وەپەردەیەکی ڕەش لەسەری نووسراوە (( زیندوو ، مردوو )) وە تەنها هەردووکوڵەگەکەو مێزی سەرۆک بەدرووشمی ڕەش ڕازاوەتەوە.

دووەم: یەکێک لە باوەڕپێکراوەکان ئەنێردرێت بۆ گەڕان بەدوای ئەو شاراوەیەو ئەگەڕێتەوەو ئەڵێت: ئەمدۆزیەوە دیسان دوانیتر ئەنێردرێن وەئەگەڕێنەوە و ئەڵێن ئەماندۆزیە و چواریتر ئەنێرن ئەیدۆزنەوە لەژووورەتاریکە.

سێیەم: باوەڕپێکراوەکە ئەڕواو تابوتەکەشیان پێیە ئەوبرایەی باسکرا ڕاینەکێشن لەتابووتەکە وەچاوی ئەبەستنەوەو وەداینەپۆشن وەلەسەریشەوە چلە دارێک هەیە، وەئەیهێنن بۆ هەیکەل وەلەنێوان دووکوڵەگەکە داینەنێن .

چوارەم: سێ گلۆپ دائەگیرسێت، دووان لەلای ڕاست وچەپیەوە لەلای سەریەوە، وەیەکێکیش لەخوارەوەی تابوتەکە لەلای قاچیەوە وەباوەڕپێکراوەکە دەستەکات بەگریان و خەفەت خواردن و پیاهەڵدان لە پێناو ئارامکردنەوەی گیانی حیرام کەنوێنەرە لەم ئاهەنگە.

پێنجەم: سەرۆک بەرەوتابوتەکەئەڕوات وەسەری هەڵئەداتەوەوهەموو هاوارئەکەن: (( حیرام زیندووە )) دیسان سەرۆک داینەپۆشێتەوە.

وەکەتەواوبوون لەوانەی کەباسکرا سەری هەڵئەدەنەوە وەچاوی ئەکەنەوەو ئەوەلەناویەتی هەڵئەستێت وەسەرۆک پێی ئەڵێ: ئەی برا ئەزانم کەتۆ بەبەرزبونەوەت بۆ پلەی مامۆستاحیرام نمایشێکی مردووی زیندوتکرد، مردوویەک کوژرابێت لەجیهادا لەکاتی چالاکیەکەی، وزیندووش بە بێدەنگی، وەپێویستە لەسەرت کەپابەندبی بە جیهادەکەی وە چالاکیەکەی وەبەنهێنی پاراستنەکەی.

وەپێویستەبرای نوێ بەم ووتانەی پێشووی باسکراو: من تەنها هێزو ویست و ..تاد.

دوای ئەوە سەرۆك نهێنی پلەكەی پێ ئەڵێ بۆیەكترناسین سێ نهێنی هەیە:

١ ـ ئەگەر بتەوێت خۆت بناسێنی لەخۆت بەرزتر یان پیتی یەكەم ئەڵێی لەناوی جاكین وەڵامت بدلتەوە بەپیتی دووەم.

٢ ـ وەیان ئەڵێیت (( مردوو )) وەڵامت ئەداتەوە بە(( زیندوو)).

٣ ـ وەیان دەستی چەپت دائەنێی لەسەر لاجانگی چەپت وەبەخێرایی دای ئەگریت كەدەست كراوەبێت .

شەشەم: دوای تەواوبونی ئاهەنگەكە و پێدانی نهێنیەكە قەمیسێكی ڕەش ئەكەنەبەر پلەبەرزكراوەكە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی كەوا بەشداریمان ئەكات بە پەشیمانی بۆ حیرام وەگلۆپەكان ئەكوژێتەوەو ئەی گەڕێننەوە بۆ ژورەتاریكەكە، پابەندبن بەم یاسایانەوە وەبەیاسای سەرەكیمانی دابنێن.

(( سەرۆك جەواب ئەدۆنیرام )).

هەروەها قەمیسەڕەشەكە پێویستە وێنەی كەللەسەر، وەچەكوش، وەگۆشەی لەسەربێت بەڕەنگی سپی وەلەژێر ئەم وێنانەشەوە ووشەی ((مردوو، زیندوو)) نووسراوە بەڕەنگی سوور.

****

پ٣٠: ئەمانەوێت ڕۆشنایی بكەیتە سەر پلەكانی یەكەم لە پلیكانەی ماسۆنی؟

وەڵام: سێ پلەی یەكەم لەپلیكانەی ماسۆنی كەبەپلەكانی چاویەستكردن ناسراوە ئەوانەی هەڵئەخەڵەتێن بەدرووشمەكانی ماسۆنی وە ئاگایان لە ترسناكیەكانیان نیە، وەئەو پلانەش: دەسپێكەر، و خاوەنپیشە، و پلەی ماستەر.

### ئەمانەش پلەکان و ئاهەنگەکانیان و هێماکانیانن:

أ ـ پلەی دەسپێکەر:

پلەی دەسپێکەر یان Entered Apprentice Degree، لەدەسپێکەر دەردەکەوێت بەپێی بیروباوەڕی گشتی ژیانی ماسۆنی، وەلەسەری پێویستە لەکاتی سوێندخواردنی ئەندامێتی کەبەرگێکی تایبەت بپۆشێت کە بارەگانەیداتێ، وەبەگوێرەی ماسۆنیەکان وەئەو ئاهەنگانەی کەهەندێك بەترسناك باسی دەکات جگە لەهێمایەك کەماسۆنیە سەرەتاکان بەکاریان هێناوە هیچیترنیە، کەمرۆڤی کۆن باوەڕی بەوەبوو کە گیانی مرۆڤ دادەبەزێت لەئاسمانەکانی دنیاوە پێش ئەوەی جێگیربێت لەلاشەی مرۆڤ لەکاتی لەدایکبووندا وەبەپێی بیروباوەڕی کۆن وەئەو گیانەش سیفاتەکانی ئەو ئاسمانە تایبەتە وەرئەگرێت کەپیایدا ڕەت بووە کاتێك کە بەرەو گیان ڕۆیشتووە.

ماسۆنیەکان واباسی ئەو چاوبەستنەوەیەی دەسپێکەرنەکەن لەکاتی سوێندخواردنی کەهێمایەکە بۆ ئەونەزانی و یان ئەوتاریکیەی کە کەسەکەتیایدابووە لەپێش ئاشکرا بوونی ڕاستی خۆی لەڕێگەی ماسۆنیەوە، وەئەو پارچە قوماشە لائەبردرێت کاتێك دەسپێکەر کەسوێندئەخوات ئامادەیە بۆ پێشوازی لە ڕوناکی، وە دەربارەی حەبلی بەکارهێنراو لەکاتی سوێندخواردندا ماسۆنیەکان وەك هێمایەك بۆ ناوك ئەیگەڕێننەوە کەزۆرگرنگە بۆ دەسپێکردنی ژیان، بەڵام دوای سوێندخواردنەکە ئەبڕدرێت بەمەبەستی خۆشەویستی و چاودێریکردن کە پێویستن بۆ بەردەوامی ژیان، دوای ئەوە سوڕانەوە بەدەوری هەیکەل دەسپێدەکات بەشێوەی سوڕانەوەی میلی کاتژمێر کەماسۆنیەکان بە جوولەی خۆری دائەنێن، وەلەکاتی سوڕانەوە دەسپێکەر هەست بەیاسای (کەون) ئەکات وەدوای سووڕانەوە دەسپێکەر کڕنۆش دەبات بۆ هەیکەل، وەئەم هەیکەلەش بەگوێرەی ماسۆنی هێمایە بۆ خاڵی بەگیشتنی کەسەکە بە درووستکەر بەرەچاوکردنی ئاینەئاسمانیەکان کە دەسپێکەر پەیڕەوی ئەکات وەئەم هەیکەلە ئەکەوێتە ناوەڕاستی بارەگا. تواناکانی

دەسپێکەر دیاریکراوە بۆنموونە ناتوانێت دەنگبدات بۆوەرگرتنی ئەندامێکی نوێ، وەمافی ڕێکخستنی کاری خێرخوازی نیە، بەلام ئەتوانێت ئامادەبێت لە کۆبونەوەکان و ئاهەنگی تەرم ئەگەر ئەندامێکی ماسۆنی مرد.

ب ـ پلەی خاوەن پیشە:

پلەی خاوەن پیشە یان Fellowcraft Degree ئەم قۆناغە نوێنەرایەتی قۆناغی پێگەیشتن و بەرپرسیاری دەکات لەژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی بەپێی فیکرەی ماسۆنی، وەپێویستە لەسەر ئەندام لەم قۆناغەدا ((ڕەوشتی چاکە)) بنیات بنێت وەهاوکاری بکات لە چاککردنی باروتۆخی کۆمەڵ کە تیایدا دەژێت. لە مەراسیمی ئەم پلیەدا کەلوپەلێك بەکار ئەهێنرێت کە لەکۆندا بیناسازەکان بەکاریان هێناوە، وەپێویستە لەسەر ئەندام کەسەرکەوێت بەسەر پلیکانەکە کۆتایی بێت لە ناوەڕاستی هەیکەلەکە وەك هێمایەك بۆ سەرکەتن و پێشکەوتن لەتێگەیاندنی ئەندام لەبیروباوەڕی ماسۆنی . لەم پلەیەدا ئەندام بەدرێژی شارەزاییەکی ورد ئەبێت لەواتاکان و هێماکانی ئەو ئاهەنگەی کە ماسۆنی پەیڕەوی ئەکات.لە گرنگترین ئەو کەلوپەلانەی بەکار ئەهێندرێت لە ئاهەنگی ئەم پلەیە گۆشەی وەستاوە کەهێمایە بۆ ـ بەپێی بیروباوەڕی ماسۆنی ـ گۆشەی داواکراو لە بینای دیوار لە بنەرەتیەکی بەهێز، وەلەم قۆناغەشدا دوو کۆڵەگە هەیە لەسەرەتای چونە ژوورەوەی گۆڕێکی هێمایی لە پەرستگای سولێمان، وەهەندێك لای وایە دوو کۆڵەکە واتای شەوو ڕۆژ ئەگەیەنن کەوا ـــ بەبیرو بۆچوونی کۆن ـــ دروستکەری گەورە بەکاریهێناوە بۆ ئامۆژگاری بەنی ئیسرائیل بۆڕێگایەك کە ئەتبات بەرەو ئەو زەویەی پەیماندراوە.

ج ـ پلەی ماستەر:

پلەی ماستەر یان Master Mason Degree وەئەمەش بەرزترین پلەیە لەماسۆنیدا، وەهەلدێ بارەگا هەیە تەنها ئەو ئەندامەماسۆنیانە وەرئەگرێت کە

گەیشتوونەتە پلەی ماستەر، لەم قۆناغەدا وەرگرتنی ماسۆنی ئەبینم لەگەڵتە دابخوێ
هاوسەنگی لەنێوان (( هۆکارە ناوخۆییەکان کەمرۆڤ ئەجوڵێنن )) وەلایەنی گیانی ئەو
ئیبەستێتەوە بە دروستکەری گەورە.

لەو هێمایانەی کە لە ئامەنگەکان بەکاری دێنن ئامێری بینایە کەپێی ئەڵێن (( مالێج ))
کەهێمایە بۆ بەستنەوەی هەموو چەمکەکانی ماسۆنی و بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی
برایەتی، وەلەروانگەی ماسۆنیەوە ئامەنگی ئەم پلەیە ئاماژەیە بۆ ماستەر لەتەلاردا
حیرام ئابیف کەیەکێک بوو لەبیناسازە سەرەکیەکان لەپڕۆژەی بینای پەرستگای قودس
لەسەردەمی سولێمان، وەلەهێماکانی تری مەراسیمی ئەم قۆناغە دروشمی خۆری
پاشایەتی یەکەهێمایە بۆ هێزەکانی بەنی ئیسرائیلی کۆن.

لەلێپرسراویەتیەکانی ماستەر دەتگاتە بڵاوەرگرتنی ئەندامی نوێ، پیان هەستان بە
کاروو پرۆژەی خێرخوازی، وە لێکۆڵینەوەو گەڕان لە پشت داواکانی ئەندامیەتی
وەبەرپرسیاریەتی ئابوری جۆراوجۆر.

هەندێك وای بۆئەچن کەپلەی ژمارەیی لەماسۆنیدا هەیە بەڵام ماسۆنیەکان ئەم
پروپاگەندەیە بە پروپاگەندەیەکی هەڵەی دائەنێن، بۆنمونە بارەگای گەورە لەئیسکۆتلەندا
پەیڕەوی یاسایەکی ژمارەیی ئەکات وەبەناوبانگترین ئەوپلەیەش پلەی ٣٣ یە وەئەمەش
ئەوە ناگەیەنێت کە ٣٢ پلە لەژێر ئەم پلەیەوە هەیە وەهەروەها ئەوەشناگەیەنێت کە
پۆلێنکردنێکی ترمەیە بۆ پلەکانی ماسۆنی، ماسۆنی تەنها ٣ پلەی هەیە وەپلەی ٣٣
بروانامەی رێزلێنان وشکۆداریە بۆکارە چاکەکان کە کەسێکی دیاریکراو هەستاوە
بەئەنجامدانی بۆخزمەتکردنی ماسۆنی.

وەهەروەها لەیاسای ماسۆنی ئیسکۆتلەندی پلەی شکۆداری تری بەناوبانگ هەیە
کەئەویش پلەی ١٤، وەئەوانە زۆرجار ئەنگوستیلەی تایبەت بەخۆیان لەپەنجە ئەکەن
کاتێك کە بروانامەی شکۆداریان پێئەبەخشرێت.

وێنەی ئەندامانی ئەنجومەنی ماسۆنی لە میسر ڕۆژانی پاشای میسری فاروق



وێنەی ئەنجومەنی ماسۆنی – لوبنانی



# ئایینی ماسۆنی

ـ بەستنەوەی سەرهەڵدانی ماسۆنی بەمێژووی مرۆڤایەتی و پێغەمبەران لە ئادەمەوە سەلامی خوای لێبێت فێڵی ماسۆنیە.

ـ بەستنەوەی ماسۆنی بە بیرباوەڕە ئاسمانیەکانەوە بۆ ڕێ ونکردن لە خەڵکی.

ـ هەڵبەستراوەکانی ماسۆنی بۆسەر پێغەمبەرانی خودای گەورە.

پ٣١: پرسیار: وابزانم گرنگە لە مەسەلەی ماسۆنی.. وەئەوەش دەربارەی مێژووی سەرهەڵدانی ماسۆنیە کەماسۆن ئەگێڕنەوە بۆ سەرەتای مێژوو لە سەردەمی ئادەمەوە سەلامی لێبێت؟

وەڵام : ماسۆنی وەکو فیکرەیەکی پیلانگێران لەسەر جیهان دروستکراوێکی جولەکەیی زایۆنیزمی پوختە کراوە، وەجولەکەی ماسۆن هەوڵئەدات بۆ چەواشەکردنی هەموان بەوەی کەماسۆنی مێژووەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئادەم سەلامی لێبێت، سەر لەخەڵکی تێکئەدەن بۆڕاستیەکان وەئەمەش ڕەوشتی جولەکەیە هەمووکات هەتا شاهین مکاریۆس کە ماسۆنیە لە پلەی ٣٣ لەکتابەکەیدا (( نهێنیە شاراوەکان لەکۆمەڵەی ماسۆنی )) ئەڵێت کە پاشا سولێمان ی کوڕی داود پێغەمبەر سەلامی لێبێت یەکەم مامۆستای گەورەبوو لە فەرماسۆنی . داود پاشایەتی گرتەدەست دوای ئەوەی ویستی ـ کوشتنی ـ ئوریا مێردەکەی.

هەروەها شاهین[1] ئەڵێ مامۆستا گەورەکانی ماسۆنی ئەمانەن پاشای پێغەمبەر سلێمانی کوڕی داود سەلامیان لێبێت وەحیرام پاشای دووەمی مامۆستای گەورە، وەحیرام ی سێیەم مامۆستای گەورە، ئەوانەبون کەوا دەستەی ئەنجومەنەکانی ماسۆنیان کردە سەر شێوەی هەیکەلی ئۆرشەلیم، وە خوێندنەوەی دەقەکانی تەوراتی زیادکرد لەکۆبونەوەکانی تەرخانکردنی ئەندامان وەئاهەنگەکانی ماسۆنی بەڵگەیە بۆ جولکەیی ماسۆنی.

****

پ ٣٢ : هەردەم ماسۆنی بیروباوەڕی ئەبەستێتەوە بەبیروباوەڕەکان و نێردراوە ئاسمانیەکان، ئایا تاچەند ئەمە ڕاستە؟

---

١) شاهین مکاریوس( ١٨٥٤ ـ ١٩١٠ ) ماسۆنی مەسیحی عیلمانیە دژ بە کەنیسەی مەسیحیە ماسۆنیە لەپلەی٣٣ .

وەلام : بەڵێ ماسۆنی هەوڵیدەدات ماسۆنی وادەربخات کە پەیوەندییەکی ئاسمانی بە ئەبەستریتەوە بەبیروباوەڕە ئاسمانی و پەیغەمبەران و ئەوەڕاوانەوە ، بەم شێوەیە خستیەڕوو ماسۆنی گەورە موحەممەد ڕەشاد فەیاز لەکتابەکەی ((ڕووناکی گەورە)) وەئەم پیاوە سەرۆکی ئەنجومەنی شەرەفی گەورەی جیهانی ماسۆنی یە[1].

وەلەکتابەکەی (( ڕوناکی گەورە )) فەییاز هەوڵەدات قسەی هەڵبەستراو لەنێوان کتابە ئاسمانیەکان و وەنێوان کتابە دانراوەکان بۆ چەسپاندنی لەسەر ساوێلکەکان کەوا بیروباوەڕی ماسۆنی بەناوبانگترو بەرزترینە لەهەموو بیروباوەڕەکانی تر کەناتەواوین بەبۆچوونی ئەو، وەدەسپێدەکات بەناوی ڕوناکی ئەڵێ: ئەندازیاری بێکۆتایی گەورە وە بە بوون و ڕوناکی و هۆشی خۆیی، وایدائەنێت کەجیهان شوێنەوارێکە لە ئەندازەییەکەی.

وەفەیاز ئەڵێت نوح سەلامی خوای لێبێت وەهاوەڵەکانی کاتێك زانیان چی بەسەر ئەوخەڵکە دێت لەبێباوەڕان لە خنکان وە بەمیلاکچوونی سەرنشینانی کەشتیەکەلەگەڵ هاوەڵانی بیناسازە ئازادەکانی کەشتی ڕزگاربوون لەنێوان شەپۆلەکانی نەزانی و تاریکیدا، بەلام برا ڕزگارکەرەکان بیروبڕوا سێ سەردارییەکەیان ژیاندەوە، لە هەیکەلی نورانی کە دامەزراوە لەسەر چاکترین بنچینەی زانست و زانیاری.

بەمشێوەیە فەییاز ئەڵێ بیناسازانی ئازادی ماسۆنی هەبوون لەئادەمەوە سەلامی لێبێت وەگشت پێغەمبەرەکانی تر وەئەمەش درۆو بوختانە.

---

٢) موحەممەد ڕەشاد فەیازتەرخانکرا بۆ ماسۆنی سالی ١٩٢٤ لەئەنجومەنی فەلتە لەتورکیا وەبوو بەسەرۆکی ئەنجومەنی ماسۆنی ژمارە ٣٨ ئاستانجول وەبەرزکرایەوە بۆپلەی٣٣سالی ١٩٢٦ وەبەرزکرایەوە بۆزۆرێك لە پلەکانی ماسۆنی بالا لەوانەش سەرۆکی ئەنجومەنی خۆرهەلاتی جیهانی سالی ١٤٠٦کۆچی.

ئەڵێ تەواوبوونی بیروباوەڕی ماسۆنییەکان لەهەموو سەردەمەکاندا لەهەموو بیروباوەڕەکانیتر پەسەندکراوترو بڵاوبێتکراوتربوو، وەئەڵێ کەداود پاشاو پێغەمبەر سەلامی لێبێت یەکێبوو لە بیناسازە ڕەنگارەکان، و پارێزکارییکرد لەبیروباوەڕەکان و پەیمانەکان وە وەسیەتیکرد بەدروستکردنی پەیکەری هێمای مرۆڤایەتی، کەسولەیمانی کوڕی جێبەجێکرد وە پەیکەری مرۆڤایەتی دروستکرد لە ئۆرشەلیم، وەحیرام ئەبیف سەرپەرشتیاری ئەندازیاری دروستکردنی کرد، سولەیمان و حیرام لەبەردەم پەیکەرەکە دوو کۆڵەکەیان دانا لەبەردی ئەلماس وە ناویان نا لەکۆڵەکەی ڕاست پیتی (ب) وە لەکۆڵەکەی چەپ پیتی (ی) یان (ج) هێما بۆ هەردوو گەورەزاتەی یوسف و بنیامین.

****

پ٢٢: کێ وشەو هێمای داناوە بۆ پلەکانی ماسۆنی ؟

وەڵام: لە دوای تەواوبوونی هەیکەل حیرام ئابیف وشەی هێمایی نهێنی دانا بۆ پلەکانی ماسۆنی وەشیکردنەوەی قەوارەی بوونی بەسێ ڕوکنی پلەدار وەدوای ئەمە حیرام تیرۆر کرا لەلایەن سێ کەسەوە.

****

پ٢٤: هەیکەل چییە لەماسۆنیدا؟

وەڵام: هەیکەل شوێنی پەرستنە کامینە گەورەکانی شوێنەوارناسان بەپیرۆزیان دادەنا.

****

٦

# گرنگترین بیروباوەڕەکانی ماسۆنی

- پەیوەندی ماسونی بەئاینەکان.

- ماسۆنی و جیاکردنەوەی ئاین لەدەوڵەت.

- واتای درووشمی ماسۆنی (( ئەندازیاری گەورەی گەردوون ))

- چۆن ماسۆنی دزەی کردە ناو مەسیحیەوە.

- جیاوازی تێگەیشتنی سەربەستی و برایەتی و یەکسانی لەماسۆنی لەئیسلامدا.

پ٢٥: پەیوەندی ماسۆنی بەبیروباوەڕەکانی ئاینیەوە چیە؟

وەڵام: ئامانجی گەورەی ماسۆنی نەهێشتنی بیروباوەڕی ئاینی و دژایەتیکردنی گشت ئاینەکانە و ئامادەکاری ئەکات بۆ هاتنی مەسیحی دەجالی چاوەڕوانکراو لەلای جولەکە، لەبەرئەوەی ئەم مەسیحی دەجالە بانگێشەی خوا بۆخۆی دەکات لە کۆتایی دنیا.

****

پ٢٦ : چۆن ئەکرێت ماسۆنی ئاینەکان هەڵوەشێنێت؟

وەڵام: ماسۆنی داوادەکات بۆ لێکۆڵینەوە بەدوای ڕاستیدا، وەلەچوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەشدا بانگەشەی دەربرینی ئازادی هۆش وەئاین وپێغەمبەرایەتی و نوێژ وەهەرشتێك کە هەر ئاینێکی ئاسمانی باسی لێدەکات بکرێتە بابەتی لێکۆڵینەوە. ئەوان ئەڵێن ئاین لە ڕوانگەی سایکۆلۆجیەوە ئەبینرێت، بەم شێوەیە ڕونیدەکاتەوە جێگری ئەنجومەنی ماسۆنی لەبەرلین وە ئەڵێ: ئەوانەی کەخاوەنی فکرەی ئازادن بریارئەدەن وەئاشکرای ئەکەن ئازادی ویژدان وئازادی لێکۆڵینەوە، واتە ئازادی ڕەخنەی بیروباوەڕی و ئاینی، ئەوان هەموو بیروبڕوایەك ڕەتئەکەنەوە کەلەسەر بنچینەی سروش — وحی — کەسەرچاوەکەی هەرکوێیەك بێت ئەم سروشە[1].

وەلەڕونکردنەوەیەکدا هات کە ڕۆژهەڵاتی گەورە لەفەرەنسا ڕایگەیاند لەساڵی ١٨٥٦:

(( ئێمەی ماسۆنی ناتوانین بوەستین لەشەڕکردن لەنێوان ئێمە وە نێوان ئاینەکان، چونکە هیچ ڕێگایەك نیە نەبۆڕزگاربونمان وەنەبۆ ڕزگاربونیان، وەئەبێ یان بمرن یان بمرین، وەماسۆنی ئارام نابێت تەنها لەدوای داخستنی پەرستگاکان نەبێت )) .

---

١) الانبیات الماسونیه ـ د.حسین عمر حماده.

کرکفیل لەئەنجومەنی مەنفیس لەلەندەن ووتی:(( ئێمە ئەگەر ڕێگەماندا بەموسوڵمان یان بە نەسرانی بەچونە ناو یەکێ لەهەیکەلەکانمان، ئەمەش وەستاوە لەسەرمەرجی ناوخۆ پێویستە لەسەرمان بەچەولشەیان بخەین، کە نکوڵی بکات لەکارە ئەفسوناویەکانی و خیالیەکانی کە هەڵخەڵەتا پێی لەگەنجبەنیدا)) [1].

وەهەروەها لە کۆنگرەی ماسۆنی لە بلفۆر هاتووە ساڵی ١٩١١: (( ئێمەی ماسۆنی دوژمنی ئاینەکانین، لەبەرئەوە لەکۆمەڵگاکانمان هەموو توانایەکمان بەکاردەهێنین بۆسرینەوەی کەمترین دیاردەی ئاینی [2].

****

پ٣٧: ئایا پەیوەندی هەیە لەنێوان بیرو باوەری جیاکردنەوەی ئاین لەسیاسەت یان بەوەی کەبە عیلمانی ناساوە؟

وەلام: ماسۆنی بەجولەکە بوو هەوڵ ئەدات بۆ نەهێشتنیئاینەکان، وەلەبەر ئەوە جیاکردنەوەی ئاین دامەزرا: (( رامیاری نیە لەئاین وەنە ئاین هەیە لە رامیاری)) .

بەعیلمانی کردنی بیرو باوەری ئیسلام فراوان بووە بۆجیاکردنەوەی یاسا ئاینیەکان لە یاساکانی شارستانی بەشێوەی پیلانێکی ڕێکخراو بگونجێت لەگەڵ کۆ مەڵگاکان، شۆرشی فەرەنسی هات بۆجێبەجێکردنی ئەم بیرو باوەڕەی جیاکردنەوەی ئاین لەسیاسەت یان جیاکردنەوەی کەنیسە لەدادگای شارستانی، وە ئەم دەقەش لەدەستوری فەرەنسی هاتووە، وەرگێرانی تەواو بۆزاراوەی عیلمانی (( نائاینی )) یان دونیایی، وەبەواتای جیاکردنەوەی کەنیسە کەدەسەلاتێکی ئاینە لە دەوڵەت هەروەك رویدا لەدوای شۆرشی فەرەنسی.

---

١) تەماشای (( أوقفوا هذا السرطان)) ــ دسیف الدین البستانی.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەڵام لە وڵاتە عەرەبییەکان و ڕۆژ هەڵاتە موسوڵمانەکان پیلانی ماسۆنی بە جێبەجێکردنی عیلمانی بەقۆناغ بوو بەبنیات نانی کاریپێویست دەستی پێکرد کە پەیوەندی ڕوکەشی هەیە بە موسوڵمان یان ئەگونجێت لەگەڵ موسوڵمان تەنها لەڕوی بیرو باوەڕەوە، وەدەقەکانی چارەسەرناکرێت بەدرێژی کەوا ڕێنەکەوێت لەگەڵ بارودۆخە وەستاوەکاندا یان بنیتنانی کاری پێویست لەبری هەندێ لایەنی موسوڵمان، وەجیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت لەکۆتادا وەئەوەش ئامانجی دیاریکراوی ماسۆنیە.

وە ئەو قۆناغانە جێبەجێکرا لەوڵاتە ئیسلامیەکان لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە، وەئێستاش ئەیەوێت بەرهەمەکەی کۆیکاتەوە وەئەمەشی بەدەست هێنا لەهەندێ لەو وڵاتانە وەك تونس و تورکیا

****

پ٤٨: ئەبیستین کەماسۆن دەستەواژەی ((ئەندازیاری گەورەی گەردوون)) بەکار ئەهێنن وەئەیکەنە بروشمی خۆیان، واتای ئەم درووشمە چی یە؟

وەڵام: (( ئەندازیاری گەورەی گەردوون )) بریتیەلە پیرۆزیەك لەلای ماسۆن واتە ئەندازیاری گەورەی ماسۆن تەنها درووستکەر نییە لەم گەردوونە، بەڵکو ئەندازیاری تریش هەن پشتیان پێبەستوە وەلەناویشیاندا ئەولە هەموویان گەورەترە، وەبەمەش ئینکاری تەنهایی خودا ئەکەن. ـ پەنابەخودای تاك وتەنها ـ

****

پ٤٩: چۆن ماسۆنی چووەناو ئاینی مەسیحیەوە؟

وەڵام: هەروەك باسمان کرد بیرو باوەری ماسۆنی نورانی پلانگێری لەگەڵبونی جولەکەدا هەیە لە هەموقۆناغەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، وە دوای هاتنی مەسیح سەلامی

بەشدارینەکات لەگەڵمان لە ناوچەی ٢٤٥ کەبەدوا چونی بۆدەکەین، وە هاوتانەکردنی زایۆنیزموم و ئیسرائیل بە دەسپێکردنی شەڕ ساڵی ١٩٤٨ وە ١٩٥٦ وە ١٩٦٧.

مامۆستا ( ئەبو سەلام ئەحمەد عەبدوڵلا ) وەڵامی ئەم بانگەشەیە ئەداتەوە و ئەڵێ:

وەڵامی ڕۆتاریەکان ئەدەینەوە زۆر بەدرێژی:

مەرجی پابەندبوون بە نمونەی بەرز لەئەندامی ڕۆتاری مەرجێکی نەگریسە بۆواتایەکی شاراوەیە ئاشکراکردنی کە ئەندام پابەندبێت بە نیشانەیەك لەنیشانەکانی ئاینە ئاسمانیەکان بێنەوەی سەر بە ئاینێکی دیاری لەئاینەکان بێت، وەبەواتایەکی تر پێویستە ئەندام ئامادەبێت بۆڕەنگ گرتن، نەبانگەشە وەنەتووندڕەوی بکات بۆ ئاینێك لەسەر حیسابی ئاینەکانی تر، لەبەرئەوەی هەمو ئاینەکان لای ڕۆتاری وەك یەکن بێجیاوازی! !

وەئەگەر دامەزرا لە فەرمانێکی ڕابەری توانیتی ئەم بیروباوەرە وێرانکاریە بکشێنێتە نێوان سەرگەورەکان و ئەوانەی کارئەکەن لەگەڵیا، وەئەمەش هۆیەکی سەرکەوتووە بەبێ شك بۆکاریگەری ڕاستەو خۆ لە قەوارەی کۆمەڵ و فراوانکردنی بنچینەی گەندەڵی بیرو باوەری فیکری و ئیمانی بەیەکتاپەرستی ئیسلام، پێچەوانەی فەرمودەی خودای گەورەیە لەسورەتی (آل عمران).

﴿ ان الدين عندالله الاسلام ﴾ (آل عمران :١٩ ).

﴿ ومن يبتغ غير الاسلام دينا فلن يقبل منه وهو فى الاخرة من الخسرين﴾"آل عمران٨٥ "

ئینکاری کردنی هەر ئایەتێك لەکیتابی خودا یان لاری لەبونی خودا یان گاڵتەکردن پێی ێوەیەکە لەشێوەکانی (دەرچونە) لە ئاین کە هیوای بۆدەخوازن کوران و بەکرێگیراوانی ایۆنی لە وولاتە ئیسلامیەکانماندا بە بانگەشەی ڕێزگرتنی تێکەیشتن و ئاشتی لەنێوان ەلان.

ئەوەی کەڕوودەدات لەناو یانەی ڕۆژانەی موسوڵمانەکان پارەتی وەرئەگرن لەکاروباری ئاینەکەیان هاوتایە لەگەڵ داپوندریت و ڕەوشتی ئەوانەی ئاینیان نیە.. وەدانەماڵدرین زۆر بەهێمنی لە بیروباوەری ئاینەکەیان بێئەوەی هەستی پێبکەن وەلەگەڵ پیاو خراپان دادەنیشن و مەی ئەخۆنەوە، وەقومار ئەکەن وەئامادەی ئەنجومەنە تاریکەکان ئەبن، وە سەما ئەکەن لەگەڵ سەماکەران وەنێکەلاوی تێکەلاوبوان ئەبن. وەبیر ئەکەنەوە وەك چۆن ئەوان بیر ئەکەنەوە، هیچ لای خۆیان نامێنێتەوە تەنها دۆخی گومانئاوی تووڕەیی خودا لێیان وەلەسەرئەوەی کەهاوڕێیەتیان ئەکات وە ئەوەی کە خۆشیانی ئەوێت وەلەوەی کە ئینکاری ئەکات لە ڕاستی، وەلەوەی کە ڕازی بوو بە ناڕەوایی وەخوا بینەرە لەوەی کە ئەیکەن..

• گومانمان هەیە کە ئەوەی ڕوبدات لەنێوان شەوو ڕۆژێکدا ئەوە بەپیلان و ڕێنمایی و دانان و ڕێکخستنی کتابەکانی ڕۆتاری دەریدەبرێت وە پیاچونەوەیەکی نهێنی کە ژمارەیەکی باشمان دەسکەوت، شوێنێکی تری ئەم پەرتوکانە ئەگوازینەوە لێی کە ئەو پیلان و ڕێنمایی و ئامادەکردنە دڵنیا دەکاتەوە.

وەلەبەرئەوە دورئەڕۆین بۆ بەدواچون لە پەیوەندی ڕۆتاری بەزایۆنیزمەوە وەلەوانەی ئەوان وتویانە کەئەختێك لەمەوپێش باسمان لێوە کرد، ئەوان ڕەچاوی دەسەلاتی تایبەتیان نەکردووە بۆ زایۆنی لە یانەکانیان کە بەخێرایی چووە ناو زۆر لە دامودەزگاکانی جیهانی کە میسر تیایدا بەشدارە.

وەئەوەی هیچ نەزانن ئەلێن:( زایۆنیزم لەناو ڕۆتاری دەسەلاتی هەیە بەلام تایبەتی نیە) وەسەرزەنشتمان ئەکەن کە توڕەبین لەودەسەلاتە کەتایبەتی نیە، وەبەلگەیان بۆئەو سەرزەنشتە ئەوەیە کەمیسر نوقومبووە لەدەسەلاتی زایۆنی کەچووەتە ناو زۆرلە دەزگاکانی وولات کە بەشداری تیادەکات هەر نوقومبویەك لەدەسەلاتی تایبەتی.

پ٦٦: ئایاڕاسته ڕازیبوونی سکرتاریەتی ڕۆتاری جیهانی مەرجی داناوە بۆوەرگرتنی ئەوانەی پاڵێوراون بۆ ئەندامی یانە؟ وەئایا ڕاستە ڕێگەنادرێ بەکردنەوەی یانەی نوێ هەتا لەدوای ئەوەی سکرتاریەتی ڕۆتاری جیهانی ڕەزامەند نەبێت؟

وەلام: ئەم پرسیارە هاتبوو لەکتابەکەی مامۆستا ئەبو ئیسلام ئەحمەد عەبدوڵلا لەسەر ڕاستی ڕۆتاری وە وەلامی ڕۆتاریەکان ئەداتەوە:

یاساو بەرنامەکانی ڕۆتاری سەربەخۆیی ئەداتە هەموو یانەکان کە ئەتوانێت هەڵسوکەوت بکات چۆنی بوێت لەچوارچێوەی یاسای گشتی. وەئەو بەرنامانەی کە ڕۆتاری جیهانی پێشنیازی ئەکات.

وە(یانە) ئازادی تەواوی هەیە لە هەڵبژاردنی ئەندامی نوێ وەئەوەی کە پێویستە لەسەری ناوی ئەو کەسە بنێرێت کە ئەیەوێت ببێتە ئەندام یان ئەندامیەتی کۆتایی دێت بۆ سکرتاریەتی ڕۆتاری جیهانی.

ووتەی یەکێك: ئەمە دەرکردنی زانیاری ستراتیجیە لە ئەندامانی یانەکان وەئەوانەش لە پاك و پوختەکانی وولات بوون. بەلام ڕاستیەکەی ئەوەی ئەنێردرێت لە وەسفی پیشەی ئەندامەکە تێپەڕ نابێت.

بەلام لەکاتی دامەزراندنی یانەی نوێ ئەوەپێویستی بە ڕەزامەندی ڕۆتاری هەیە بۆڕاپرسی مەرجی دیاری و ئاشکرا. وە لێرەدا سیخوڕی یان کۆکردنەوەی زانیاری نیە، بەلام ئیشوکاری ئیداریە لەپلەیەکی بەرزدایە لە ڕێکخستن تائێستا ئێمە پێی نەگەیشتوین بۆیە خراپە ئەکەین شکیان لێبکەین!!

وە وەلامی ئەم بانگەشەکردنە ئەداتەوە مامۆستا/ ئەبوئیسلام ئەحمەد عەبدووڵلا لەکتابەکەیدا لەکتابەکەی کە باسمانکرد ئەڵێت:

وەلامی ڕۆتاریەکان ئەدەینەوە بە درێژەی زیاتر:

تاوانکار هەموکات هەست بە تاوانەکانی ئەکات وە بەئاگادەبێت بۆدەرخستنی جیهانی تاوان بۆ دڵنیاکردنەوەی لە بێتاوانی لەکردارەکەی ·

هەروەها وتیان ــ پێشنەوەی بیڵێین ــ : ئەمە جۆرێك نیە لە دزەکردنی زانیاری ئیستراتیجی·

وەئەوەش لەڕاستیدا هۆیەکە لەهۆیەکانی دزەکردنی زانیاریە سیتراجیەکان ئەوەی بەسە کە ئەنێردرێت بۆ ڕێکخراوی ماسۆنی لە ئەمەریکا گەماڕۆدانێکی گشتیە بۆ ڕێکوپێکی وولات ـ وەك پێیان ئەڵێم ـ وەئاشکرا کردنی کارەکانیان وە تایبەتمەندیان وە ئامادەیی زانیاریان وەبارو دۆخی کۆمەلایەتی وە سالانی قالبونی، وە ڕاپۆرت لەسەر ئەرکەکانی هەریەکەو کارەکەی، وە تەنگ و چەڵەمەکانی و ئارەزووە تایبەتی و پیشەییەکانی، وە خواستنامە ئەندامیەکانی فەرمانی لێکترازانی نێوان من و نێوان سکرتاریەتی ڕۆتاری میسری·

وە ووتیان ــ پێش ئەوەی بڵێین ــ : کەدامەزراندنی یانەیەکی نوێ پێویستی بە ڕەزامەندی ڕۆتاری جیهانی هەیە .. وە یانەی ڕۆتاری لەمیسر ئەچێتە ژێر یاساکان وفەرمانەکانی ڕێکخراوی ڕۆتاری جیهانی بەڕەچاوکردنی بنەماکانی وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی کە بە لێدوانێکی فەرمی ناناسرێت بۆ ئەنجامدانی چالاکی لە میسر.

ووتیان ـ پێش ئەوەی بڵێین ــ : لێرەدا سیخوڕی یان کۆکردنەوەی زانیاری نیە، وەڕاستیەکەشی ڕۆتاری لە سەریەوە تا پاژنەی پێیەکانی سیخوڕیە وەکۆکردنەوەی زانیاریە بۆ بەرژەوەندی زایۆنیزمی جیهانی کە جولەکە سەرۆکایەتی ئەکات وە کوێرانە لە وولاتەئیسلامیەکانمانەوە کۆمەك ئەکرێن.

بەلام بەووتەی خۆیان ئەم شوێن کەوتنە(کاری کارگێڕیە ئێمە پێی نەگەیشتوین)

ئەمەش وەك دەقی پرۆتۆكۆڵەكانی زایۆنیە كە ساوا پیر ئەكات وە بانگێشی ئەمانی متمانەی هاوولاتی بە وولاتەكەی ئەكات، وەگەڕان بەدوای پێشەوای خۆی لەدەرەوەی سنووری خاكی خۆی، كە پێشكەوتن و شارستانی ــ ساختە ــ وە ئەو پیلانگێڕانەفەرامۆشیانكرد كە گەورەترین شێوەی كارگێری كە چواردە سەدەیە ئیسلام هێناویەتی وەئێستا ئەخوێندرێت لە هەندێ پەیمانگاكانی زانستەبالاكان وەبۆئەمەش نامەی زانستی ئامادەكراوە خاوەنەكانیان پلەی نایابیان بەدەس هێناوە لەگەڵ پایەی ڕێزی یەكەم، بەلام هەر بەختەوەرە، وەلەسنوری ئەرشیفی پەرتوك خانەكان دەرناچێ هەتا تەنگ هەڵنەچنێت بە زانستە كارگێریەكانەوە كە زایۆنیزمی جیهانی ئامادەی كردووە بەپێی یاساكانی و ئامانجە وێرانكاریەكانی لە پەیمانگای ماسۆنی جیهانی بۆزانستی كارگێری لە ئەمەریكا وەدامەزراندن لەسەرشێوەی خۆی وەبەپێی پەیرەوەكانی كە ئەمڕۆ لە میسر بە ئەكادیمیای سادات بۆ زانستە كارگێریەكان ناسراوە بۆ خزمەتی ئابوری زایۆنیزم بەپێی پیلانەكانی ماسۆنی جیهانی لەوێرانكاری ئاینەكان و دامەزراندنی حكومەتی جیهانی دیموكراتی نا ئاینی.

****

پ٦٧: لەبارەی یانەكانی لیونز وائەبیستین كە پەیوەندی هەیە بە ڕۆتاریەوە،ئەمە چۆنە؟

وەلام: یانەكانی لیونز لەجیهان ئەگاتە نزیكەی ٤٥ هەزار یانە ملیۆنێك و سێ سەدو پەنجا هەزار ئەندام لەخۆ دەگرێت لە ٢٠٠ وولات لەجیهان وەبارەگاكەی لە ئۆك برۆكە ــ ئیلینویز ـ لە ئەمەریكا وەدامەزرێنەری ئەو ڕێكخراوە ( میلفن جونز ) ە.

وەیانەكانی لیونزی جیهانی دامەزرا لە ویلایەتە یەكگرتووەكان ساڵی ١٩١٧ لەلایەن میلفن جۆنز، كە ئەندامی پێشوی ماسۆنیە، جۆنز جارێكیان ووتی : (( تۆناتوانی زۆر دووربیت هەتا دەس بەئیشێك بكەیت بۆ كەسێكی تر )).

وە ئەم یانانە ئەندامانی پیاوی لەخۆ ئەگرت بەلاّم لەم ساڵانەی پێشوو ئافرەتیشی وەرئەگرت.

وەلە ٢٠٠٣ نیوەی ئەندامانی نێرینە لەیانەی شێران لە ویرسستەر ـ ئینگیلتەرا ـ دەسیان لەکارکێشایەوە کاتێك کە ژنان چونە ناو یانەکە.

ناوی یانەی لیونز کە ساڵی ١٩١٩ ناوی ئاشکرا کرا لە کورتکراوەی پیتەکانی یەکەمی ئەم رستەیە بەئینگلیزی هاتووە: "Liberty, Intelligence, Our Nations Safety" واتە (سەربەستی ، زیرەکی، ئاسایش بۆگەلەکەمان) لە(گەلەکەمان جێناوی لکاوە لێرەدا ئەگەڕێتەوە بۆ جولەکە بێگومان) یان هەر ئەو واتایە بە ئەڵمانی (Freiheit, Inetelligenz, Sicherheit unserer Nation).

وەئێمەش خوێندنەوەیکی ترمان هەیە بۆئەم کورتکراوە ئەڵمانیە لەڕستەیەکەوە هاتووە واتە ژیان بەبێ ژیانی دووەم هیچ واتایەکی نیە Leben Ist Ohne Nä Chstenliebe Sinnlos !

وەئەوەی سەریە (( لیونز)) و (( ڕۆتاریە ))..باوەڕی نیە بەئیسلام ..لەپاڵ کەس و شارو ئاینەکەی، لەبەر ئەوەی ئەم ڕێکخراوانە جولەکە بەڕێوەی ئەبات.. چالاکی زایۆنیزمە .. ئامانجی بۆ نەهێشتنی ئاینەکانە.

لەبەرئەمە موفتیەکانی کۆری فیقهی ئیسلامی سەر بەیەککگرتوی جیهانی ئیسلامی لە فەتواکەی دەربارەی ماسۆنی، وەفەرمانی چونەناوی بۆی، بەلاّم ماسۆنی لقی تری هەیەو ناوی ترلەخۆدەگرێت بەڕوکەشی بەلاّم هەمان بیرو بۆچونی ماسۆنیە وەناویشی کەئەگۆڕن بۆئەوەی بتوانیت چالاکیەکانی ئەنجام بدات لەژێر ناوی جیاواز، وەگرینگترینیان (لیونز) وە (ڕۆتاری)، کەیەکناگرێت بەهەموو شێوەیەك لەگەڵ یاساکانی ئیسلام.

کۆڕی فیقهی ئیسلامی دەستەیەکی زانستیە خاوەن کەسایەتیەکی باوەڕپێکراوە سەر

بە یەکگرتووی جیهانی ئیسلامیە، کۆمەڵێك لە زانایانی نەتەوەی ئیسلامی، وەئەرکی لێکۆڵینەوەی مەسائلە نوێیەکانە کە ڕووبەڕووی موسوڵمانان ئەبێتەوە بۆڕوونکردنەوەی فەرمانی یاسای ئیسلام لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەکان، وەچوار لە چاکترینەکانی زانایان هەستان بە لێکۆڵینەوە لەسەر ماسۆنی و دەستەکانی وەگەیشتنە ئەو فەرمانەی بە کافربوونی هەرکەسێك کە پیوەندی بکات بە ماسۆنیەوە، وەزاناکانیش ئەمانەن : عەبدوڵڵای کوڕی حەمید سەرۆکی ئەنجومەنی دادگای باڵای وڵاتی عەرەبی سعودی ـــ ئەوکاتە ـــ وە موحەممەد عەلی ئەلحەرەکان ئەمینداری گشتی یەکگرتووی جیهانی ئیسلامی ـ لە کاتی دەرچونی فەتواکە ـــ وە موحەممەد محمود ئەل صەواف، وەشێخ عەبدول عەزیز کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی باز ـ خودا لێی خۆشبێ ـ .

****

پ٦٨: ناوەڕۆکی فەتوای ئەزهەری پایەبەرز چیە سەبارەت بە ماسۆنی و لقەکانیەوە؟

وەڵام: بانگەوازێك بۆ موسوڵمانان لە لیژنەی فەتوای ئەزهەری پایەبەرز سەبارەت بە ماسۆنی و یانەکانی سەر بەو وەك ڕۆتاری و لیونز : ئیسلام و موسوڵمانەکان دوژمنانی زۆر لەگەڵیانەجەنگن بەهەموو جۆرە چەکێکی دارایی و ئەدەبی، ئەیانەوێ بەمجۆرە فێڵبکەن لەئیسلام و موسوڵمان، بەڵام خودا سەرکەوتویان ئەکات وەرێزداریان ئەکات.خودا فەرمویەتی: ﴿ انا لننصر رسلنا والذين ءامنوا فى الحيوة الدنيا ويوم يقوم الاشهد﴾ (غافر:٥١ ).

وە لە نێوان ئەو هۆیانە کە شەری پێدەکەن لەگەڵ ئیسلام: هۆیەکان یانەکانە کەبەناوی برایەتی و مرۆڤایەتی داینەمەزرێنن ، وە مەبەست و ئامانجی خۆیان هەیە، وەلەنێوان ئەو یانە ماسۆنیانەو دامەزراوانەی سەر بەون وەك: لیونز و ڕۆتاری ، وەئەمانەش لە ترسناکترین ڕێکخراوی وێرانکەرن کەجولەکەو زایۆنیزم دەسیان گرتوە بەسەریاندا، ئەیانەوێت بەم شێوەیە دەسبگرن بەسەر جیهاندا لەڕێگای قەڵاچۆکردنی

ئاینەکان، وەبلاوکردنەوەی ئاژاوەی ڕەوشت، وە ڕۆڵەی وولات بکەنە ژێـر بـاری سبخوڕی کـردن لەسـەر نیشـتیمانەکەیانەوە بەناوی مرۆڤایەتیـەوە، وەلەبەرئەمـە حەرامـە لەسـەر موسوڵمان پەیوەندی بکەن پێیانەوە.

**وە ئەوەی لەم فەتوایەدا هاتووە:**

((ماسۆنی کۆمەڵەیەکی نهێنی جولەکەیە، وەمەبەست لە دامەزراندنی ژێرخستنی ئـاینی مەسیحیە، وەدوای ئەویش ژێرخستنی گشت ئاینـەکانی تـر وە گەڕانـەوەی سـەروەری بـۆ ئیسرائیل وەگەڕانەوە بۆ خـاکی فەڵەستین.. وەلەبـەریتانیا یەکـەم ئەنجومـەنی ماسۆنی دامـەزرا وە دروشمەکـەیان بـووە: سەربەسـتی و برایـەتی و یەکسـانی.وەلەلەندەن ئـەم بریارە دەرچوو کەڕاستی مەبەستەکانیان دەر ئەخات:

- شەڕکردنی گشت ئاینەکان وکاسۆلیکی بەتایبەتی.

- ژیاندنەوەی گیانی بێبڕوایی و ڕێگەدانی لەنێوان گەلان.

وە لـە ئەمـەریکا و شـوێنانی تـر ئەنجومـەنی بۆدامەزرانـد، وەبـە دروشمـەکانی هەنـدێ لەموسوڵمانانی هەڵخەڵەتاند وە پەیوەندیان پێوەکرد، کە ئامانجەکەی بۆ دەرکـەوت وازی لێهێنا، وە زۆریەیان ترسان کە نهێنیەکانیان بلاو بکەنەوە تاکو نەکوژرێن.

وە چەند بڕوانامەیەکی گەورە نووسەرانی ڕۆژئاواکان هەیە، وە هەروەها بلاوکراوەی فەرمی جولەکە و لێکۆڵینەوەی پسپۆران، وەهێڵکاری فراوانی جولەکە ئاشکرایە بۆ تێکدانی جیهان لەژێر دروشمەکانی بریقەدار کە پێویستە موسوڵمانان به ئاگابن لێی.. وە هەتا کارەکانی زیاتر ئاشکرا نەبێت، وە بۆ بەئاگابون لە بلاو بونەوەی بەشێوەیەکی فراوانتر ماسۆنی دەرکەوت لەژێر ناونیشانی جیاواز، وە چەندەها لقی دامەزراند، لەوانەش: ئەلبنای برث، وە کەیوانی وە لیونز وە ئەکستشانج وە یەککرتن و سەرکەوتن وە یانەی قەڵەم وە یانەی خاچە درەوشاوەکان، وەهەروەها کۆڕی فیقهی بڕیاریدا لە

بەستنی خولی یەکەمی لە مەککەی پیرۆز ـ خوابیپارێزێت ـ لە دە ی شەعبانی ١٣٩٨ کۆچی ڕێکەوتی پانزەی حوزەیرانی سالی ١٩٧٨زاینی لە پەردلوی ماسۆنی و ئەوانەی پەیوەندیان پێوە کردووە وەفەرمانی شەریعەتی ئیسلامی تیایدا، ماسۆنی بە ترسناکترین ڕێکخراوی وێرانکاری دادەنرێت لەسەر ئیسلام و موسولمانان، وەهەر یەکێك کە پەیوەندی پێوە کردبێت وەزانیاری هەبێت لە ڕاستیەکانی وە ئامانجەکانی ئەوەدەرچووە لەئیسلام.

****

پ٦٩: زاناکانمان دەربارەی ڕۆتاری چیان وتووە؟

وەلام: زانایـانی ئـاینی ئاگاداریکردوینەتـەوە لـە ترسناکیەکانی ڕۆتـاری بەئاشـکرا لـە وتەکانیان لە وانەش :

شێخ موحەممەد متـەوەلی شـەعراوی ــ خـوا لێـی خۆشبێت ــ کـە وتـی: ئاوبـڕیوانان بێنەوەی بزانن لە پشت ئەم بانگەشانەو (یانانە) وە پێویستە وریابن، بـەلام هـەلهاتوەکان نمونەیان وەك نمونەی ئەوانەیە کە لەدەرەوەی پەیرەوی خودایە کەپرسیاریانکرد:

وەلامـی دایەوە:بۆڕێژۆشـکاندنی مـانگی ڕەمـەزان، وەبـەربانگیش بـەپێکێك مـەیبێت، وەنرخی مەیەکەش بەپارەی بەرازێك کردرابێت، وەبەرازەکەش دزرابێت.

ـ بۆچی بەم ئالۆزیە!

وەلامی دایەوە: هەتا ئەوەی ئەنجامی ئەدەم چوارجار حەرامبێت.

بەم شێوەیەئەکات دەرچوو لە پەیرەوی خودا ــ پـەنا بـە خـودا ــ ئـەوان دزە ئەکـەن بۆناو کۆمەل لە ڕێگـای بانگەشـەی چـاکەوە، وە ئـەبینین چـاکترین لـەپیاوەکانی کۆمـەل هەلئەخەلەتێن بە ڕوکەشی بانگەشەکانیان.

وەلێرەدا ئەپرسین: بۆچی کرداری چاکە ئەکەن بەناوی ڕۆتاری و لیونز وەبەوجۆرە نایکەن کە بیگەڕێننەوە بۆ سەرچاوەی سەرەکی خۆیان کە ئیسلامە؟

شێخ فازڵ عەتیە سەقەر ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ سەرۆکی لیژنەی فەتوا لە ئەزهەری پێشوو ووتی : کەمترین شت کە ئەوترێت لەسەر ڕۆتاری و لیونز و هاوشێوەکانی ئەوە پێکهێنراوی گوماناویە پێویستناکات کە لەخۆبایبن بەو درووشمانەی کە بەرزی ئەکەنەوە، وەکەنیسە زیری نواند بۆئەم کارە لەگەڵیان دووا «ڕاوێژ دەکەن» لە ئامەنگێك لەساڵی ١٩٢١ بەڕێوەچوو لەنیۆیۆرك بەم شێوەیە وەسفیان کرد: (( شتێکی نا ڕەوشتی باڵ ئەکێشێ بە سەرزیدا وە بەسەر پەیوەندیە بێهاوتاکانی )).

هیچ پەند وەرگرتنێك نیە لە هەندێ ئەندامەکانی کە چوو بۆماڵی خودا ـ حەجی کرد ـ کەلەوانەبێت دەستی لەگەڵ بیروباوەری وێرانکاری بێت دەسپێشکەری ئەکەن بۆ حەجکردن، کوفرنیە بەوەی ئەنجامیاندا وەگەڕانەوە بۆلای خودا، بەڵام لە ترسی ساویلکەیی ئەوا بیرو بۆچونیان وکردەوەیان جیاواز نین لەگەڵ ئاین.

وە شێخ موحەممەد غەزالی ئەڵێ ـ خوالێی خۆشبێت ـ :ئەم ئەنجومەنانە جگە لە ئامێرێکی جولەکە هیچیتر نیە بەکەسانێکی موسوڵمانان کارئەکەن بۆجێنشینکردنی ئیسرائیل وە لابردنی تەنگوچەڵەمەکان بەرامبەر بوونی لەناوجەرگەی ولاتانی ئیسلامی بەشێوەیەك لەشێوەکان، نەتەوەکان هاندەدات بۆلەبیردنەوەی بیرو باوەڕیان بۆ ئاسانکردنەوەیان دوای ئەوەی درووشمە پرشنگدارە درۆکانیان بکەنە ڕێگایەك بۆ لەدایکبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل لەژێر بانگەشەی کەگوایە لەسەروی ئاینەکان و سەروی ڕەگەزەکانە.

مامۆستا عبداللە التل ئەڵێت: یانەی ڕۆتاری کۆمەڵەیەکی جولەکەیە خۆی وایپیشاندەدات بەکارکردنی مرۆڤایەتی لەپێناو چاککردنی پەیوەندیەکان لەنێوان مرۆڤدا، وەخۆی وایپێشاندەدات کەچالاکیەکانی کۆکردووەتەوە لە چەمکەکانی ڕۆشنبیری و

کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی.

وە ئەم کۆمەڵانە یانەیان هەیە لەسەرانسەری جیهان کەسایەتی گەورە و بچوك پەیوەندیان پێوەدەکەن لەڕێگەی ئامەنگەکان و کۆڕەکان کە بانگەشە دەکات بۆ نزیك بوونەوە لە ئاینەکان، وەهەڵوەشاندنەوەی ئەوانەی کە دژایەتی جولەکە دەکەن، وەئەمەش کارئاسانییە بۆ تێکەڵبونی لەناو کۆمەڵگاکانی تر.

دکتۆر مستەفا مەحمود - ڕەحمەتی خوای لێبێت - ئەڵێت: کاتێك کە ئەمرۆ ئەفەرێنێت، کوندەپەپوو لەهەموو کەلاوەیەك ئەقیرێنێت وە مۆزو تایەفەکان کۆدەبنەوە لەژێر هەزارناوو ناواندا وەلەژێر هەزار دروشم و دروشمدا، وەبەرگی ئەو گەلانەو دروشمەکانیان وە مەزهەبە ئاشکراکراوەکانیان تەنها بەرگێکی خۆگۆڕینە کەلەژێرەوەی ڕم و خەنجەرو باروت ئەشارنەوە.

دکتۆر یوسف قەرزاوی ئەڵێت : یانەکانی ڕۆتاری و لیونز و ئەوانی تر لەکۆمەڵە گوماناویەکانی تر توانیتیان چالاکیەکانیان ئەنجام بدەن لەوولاتانی موسوڵمانان بەهەڵخەڵەتاندنی خاوەن پلەکان و خاوەن ئاوات و تەماحکاران کەگوایە کۆمەڵەی ڕۆشنبیری و خێرخوازیە کەلەبەرامبەریان دەرگای کاری کۆمەڵایەتی ئەکاتەوە بۆیان بەبێ نارەحەتی یان بەستنەوەیان بە ئاینەوە یان بەسیاسەت، وەلەبۆچونە تایبەتەکانی ماسۆنی زایۆنی ئەو هەڵخەڵەتاوانە کەرەسەی تێکدەری و پاچن بۆ تێکدانی کۆمەڵگای ئیسلامیمان.

ئەی بۆچی موسوڵمان گرنگی ئەدات بە پەیوەندیکردن پێیانەوە کە دەوروەدراوە بە نهێنی وە ناڕوونە لەلای خۆیەوە وەدەورەدراوە بە شك و گومان لێرەو لەوێ ؟

وەهەروەها شێخ عەبدول جەلیل شەلەبی ئەڵێت: یانەی ڕۆتاری ناسراوە کە لقێکە لە کۆمەڵەی ماسۆنی گشتی وەماسۆنی واتا ((بیناسازی ئازاد)) کۆمەڵەی جولەکەی کۆن

کارئـەکات بـۆ بەرژەوەنـدی زایـۆنیزم وەئـەوانیش خۆیـان نیشـان ئـەدەن بـە چـاکەو خزمـەتکردنی نـەداران، وەیانـەی ڕۆتـاریش بۆهـەمان مەبەسـت کاردەکـات وەخـۆی بەدورناگرێت لە هیچ یەکێك لەخەڵکی کەپارەتیان لێوەربگرێت وەئەمەش هیچ هەیبەتێکی تیانیە، بەڵکو هەیبەت بۆدەوڵەمەندەکان و کۆمەڵە ئیسلامیەکانە کەچاودێری پێداویستی ئەوانە ناکەن.

پ۷۰: ئایا یانەکانی ڕۆتاری لەوولاتانی عەرەب هەڵوەشێنرانەوە؟

وەڵام : لەهەندێ وولات هەڵوەشێنرانەوە وەك عێراق ساڵی ۱۹۵۹ وەسوریا ساڵی ۱۹٦۵ وە لوبیەی سـاڵی ۱۹۷۸ وە هۆشـداری درا لەسـەر نووسـینگەی ناوچـەی عـەرەبی سـاڵی ۱۹۷۷، تەنهالـە میسـر چـالاکیەکانی ئـەنجام ئـەدا وەگـەورە پیـاولنی سیاسـەت و ئـاین پەیوەندیان پێوەکرد، وەسەرۆکی یانەکانی ڕۆتاری میسری ڕۆژهەڵات ((مۆزان موبارەك)) بـوو وەهـەروەها لەئەندامەکانیشـی زۆرێـك لـە هونەرمەنـدان و ڕۆشـنبیران و زۆربـەی وەزیرەکانی پێشوو بوون وە هەندێك لەوانەی کـە بەرێوەبەرایەتی دەسـەڵاتیان بەدەست بوو.




دروشمی ڕۆتاری



بۆل هاریس

دامەزرێنەری یانەی ڕۆتاری جیهانی



چوار دامەزرێنەرەکەی ڕۆتاری ـ بۆل هاریس و براکانی.

١١

# چیرۆکی ماسۆنی لـە میسر

ـ کەی میسر فیکرەی ماسۆنی زانی؟

ـ موحەممەد عەلی پاشاو ماسۆنی.

ـ سەدەی ئاڵتونی بۆ ماسۆنی لەمیسر دوای موحەمەدعەلی.

ـ چالاکی ماسۆنی لە میسر تاکو ساڵی ١٩٦٤.

لەدوای کۆتایی هێنان بە قسەکانی ڕابردوومان هاوڕێکەم ڕۆیشت لەسەر بەڵێنی بەیەک گەیشتنەوەمان ئەمڕۆ ، هەر کەدڵنیشت لەشوێنەکەی خۆی دەستپێشخەری لێم کرد و وتی: بەدرێژایی شەوو بیرم هەر لای ئەوەبوو چۆن ماسۆنی چووە ناو وڵاتانی عەرەبەوە وەبەتایبەتی میسر، وەچی پێکرد؟ ئایا گفتوگۆی ئەمڕۆمان ئەکەیتە باسی ماسۆنی لەمیسر وەپرسیاری یەکەم:

پ۷۱: کەی میسر ماسۆنی ناسی؟

وەڵام: لەڕاستیدا میسر ماسۆنی ناسی لەگەڵ هێرشی فەرەنسا بە سەرکردایەتی ناپلیۆن بۆناپەرت کاتێك میسر و خاکی فەلەستینی داگیرکرد لەساڵی ١٧٩٨ ، وەئامانجی ناپلیۆنی ماسۆنی ئەوەبو کە ماسۆنی و ئەنجومەنەکانی بکاتە میسرەوە، وەجێبەجێکردنی فیکرەی عیلمانی کەدژایەتی ئاین بکات لەمیسرو لەشام.

ناپلیۆن هەندێك لەسەرکردەکانی ڕاسپارد بەدامەزراندنی یەکەم ئەنجومەنی ماسۆنی لە شاری ئەسکەندەریە، وەناوێکی فیرعەونی لێنا کە ئەویش ئەنجومەنی ((ئیزیس))ە لەئابی ١٧٩٨ .

دوای دەرچوونی هەڵمەتی فەرەنسی لە میسر ماسۆنی بەردەوامبوو لەسەر ڕێڕەوی خۆی وەهاوکاری فەرمانڕەوایی محمد عەلی کرد لەمیسر، وەپیلانەکەی ماسۆنی سەرکەوتوبوو بۆ گرتنە ئەستۆی محمد علی بە تەختی میسر ساڵی ١٨٠٥ ز.

محمد علی دەسیکرت بە فەرمان ڕەوایی میسر بەلادانی زانایانی ئاینی ـ پیاوانی ئەزهەر ـ وە دەسبەسەراگرتنی سەروەت و سامانیان ، وەدامێنانێکی دامێنا بە دامەزراندنی شێخی ئەزهەر وەئەو یاسایە تائێستاش کارپێدەکرێت، هەروەها کورتکردنەوەی چالاکی و کارەکانی ئەزهەر لەسەر میسر وەتەرخانیکرد تەنها بۆ زانستی ئاینی، بۆ ئامادەبوونی بە عیلمانی کردنی وڵات کەماسۆنیەت هەوڵی بۆئەدات.

پ٧٢: محمد علی بۆچەسپاندنی فیکری ماسۆنی چیکرد لەمیسر ؟

وەلام: لەدوای سێ ساڵ لە حوکمڕانی محمد علی لەمیسر ساڵی ١٨٠٨ فەرمانێکی دەرکرد بە جیاکردنەوەی ئاینی ئیسلامی و زانستەکانی لە وولات و سیاسەت وەئەمەش بەرزترین ئاواتی ماسۆنیە، وەئەمەشی ئەنجامدا لەئەوروپا.

وەماسۆنی هاوکاریکرد لە ئەوروپا بۆچەسپاندنی فەرمانڕە وایییە عیلمانیەکەی وەزامنکردنی مانەوەی دەسەلاتەکەی بۆ منداڵەکانی، وە کارگەی بۆدامەزراند وەناوینا دلمەزراوەی میسری نوێ.

محمد علی دەسیکرد بە دڵسۆزی و ملکەچی سەپێنراوی دەربڕی وەسوپای میسری نارد بۆ خاکی دورگەی عەرەبی ـ خاکی حیجاز ـ بە سەرۆکایەتی ئیبراهیمی کوڕی بۆ شەڕکرن بەرامبەر (فیکرەی وەهابی) وەدامرکاندنەوەی بزوتنەوەی وەهابیەکان، ئەمەش دوای لاوازبونی ئینگلیز لەمەدا، سوپای محمد علی هەستا بە لێدانی مەزنیشینی خۆر هەلات و ((وەمنس ئەلخەیمە)) کەرێخۆشکەربوو بۆ ئینگلیز بۆ داگیرکردنیان .

وەمحمد علی هەستا بەلەناوبرنی پاشاکان لەمیسر لە قەسابخانیەکی گەورەدا کە ٤٠٥ لەسەرۆکەکانی مەالیکەکانی کوشت لەقەلا.

****

پ٧٣: بیستمان کە محمد علی نێردراوی نارد بۆ فەرەنسا، ئایا ئەمەش لەپیلانی ماسۆنی بوو؟

وەلام: بەڵێ محمد علی نێردراوی نارد بۆ فەرەنسا، کەلە گەنجان بون وە لەنێچیری ماسۆنی بوون لەوێ وەلە نێوان ئەو گەنجانە ((ڕوفاعە تەهتاوی)) بوو کە ٢٥ گەنجی لەقوربانیانی میسری لەگەلدابوو کە دوای ٥ ساڵ گەڕانەوە میسر، کەلە شوێنە

گشتیەکانی ڕابواردن و خواردنەوە و لە باخەڵی تیاترۆکانی فەڕەنسا بەسەریان بردبوو وە لەژێر چاودێری ماسۆن.

وە بە ماسۆنیی و عیلمانیەتیەوە گەڕانەوە بۆمیسر، ئەسۆزیان هەبوو بۆنیشتیمانەکەیان وەنە بۆ ئاینەکەیان بەڵکو تەنها سۆزیان بۆسەرگەورە زایۆنیزمەکانیان هەبوو.. وەگەڕانەوە بەفیکرەیەکی ژەهراوی ئەگەشانەوە بۆ ئازادی بەخشین بەگەنجان لەگەڵ کچاندا بە لاسایی کردنەوەی گەنجانی فەڕەنسا وەسەربەستی تەواو بە بازرگانیکردنی مادە سەرخۆشکەرەکان و بێهۆشکەرەکان، وەسەربەستیدان بە ژنان وەدەربازکردنیان بە هەموو ئەو پابەندیانەی کە وەریانگرتووە لە ئیسلامەوە، تائەو پلەیەی کە (( قاسم ئەمین ))کتابێکی دەرکرد بەناوی ((ڕزگارکردنی ئافرەت)) تیایدا داوادەکات بە ئازادکردنی تەواوەتی ژنان، وەبۆچونی گێژانەیان وابوو کە حەلاڵکردنی سرووشتی نهێنی پێشکەوتنی فەرەنساو هەموو ڕۆژئاوایە بەگشتی، بۆیە ویستیان کەلاسایی ڕۆژئاوابکەنەوە لاساییەکی کوێرانە.

****

پ٧٤: ئایا بەڕاستی محمد علی هاوسۆز بوو لەگەڵ جوولەکە؟

وەڵام: بەڵێ محمدعلی هاوسۆزبوو لەگەڵ جوولەکە وەباجی لەسەریان سووککرد بەڵکو دواجار لایبرد، جولەکەئەم سۆزداریەی محمد علی قۆستەوەو چالاکیە ئابوری و پیشەسازی و دارایی و ڕۆشنبیری زیاترکرد، وەپشتیوانیان بوو بۆمووچەو کارێکی زۆر، هەروەها ئەنجومەنی شارەوانی دامەزراند وە هەندێ لەجولەکەی تیا دامەزراند بەئەندام تیایدا وەبنیاتنانی دادگای شارستانی، وەجولەکە توانیتی دادوەری تیادابکات...هەموو ئەمانە جولکەی یۆنان و پۆڵەندای هاندا کۆچ بکەن بۆ میسر هەتا ژمارەیان گەیشتە شەش هەزار جولەکە ساڵی ١٨٤٠ .

هــەتا پــەنايان بــردە بــەر ژمارەيــەك لەجولەكــەی فەرەنســی لەشــوێنكەوتوانی ((سانسيمۆن)) بۆ ڕێكخستنی ناوەندی وولات لەهەموو بوارەكانی زانستی و ئەنـدازياری و پزيشكی و كۆمەلآيەتی، وە ئەم نێردراوانە سـەرەكی گەنـدەڵی و دواكـەتن بـوو كـە ميسر تيايدا تێپەڕی لەسـەردەمی((محمد علـی)) وە هـەتا ئێستا،كەكاريگەربوو بەبۆچـونەكانی ((سانســيمون)) و ((ڤـولتێر)) كـە بانگەشـەی لـەناوبردنی ئـاين و ياسـاكانی ئـەكرد لـە پەروەردەی گەنجان .

وەلەبيرمان نەچێت كە سولتان محمد علی گەشەی سەند بەفەرمانڕەوايی كردنی شـام و حيجاز كەبوەهۆی هەڵ ڕەخساندنی بۆ گەشـەكردنی ماسـۆنی جولەكـەو وەبلآوبونـەوەيان لەو وولآتانە، وەبەتايبەتی شام لەژێر ڕەزامەندی و چاودێری محمد علی پاشا خۆی .

****

پ٧٥: هاوڕێكەم ووتی: ئەی بۆچی ماسۆن كودەتای كرد بەسەر علی محمد علی وە وولآتە داگيركەرەكان هەڵگەڕانـەوە لێـی، وەجـەنگان لەگـەڵيا وەدەسـەلآتەكەيان لـەناوبرد هـەتا گيری خوارد لە ميسرو سودان؟

وەلآم: ووتم: لەبەر ئەوەی محمد علی پاشا دەرچـوو لـەو سـيناريۆيەی كـە ديـاريكرابوو بۆی، وە وايزانی كـە توانـای هەيـە بەسـەر جـەنگی وولآتـی عوسمـانی وەجـەنگی ئـەورپا وەئينگيلتەراو فەرەنسا ترسان لێی وە لە ناويانبرد، وە ئەمەش ڕويدا لە ناپليۆن.

****

پ٧٦: سەدەی ئاڵتونی کامەیە بۆ ماسۆنی لە میسر لەدوای مردنی محمد عەلی؟

وەلام: سەدەی ئاڵتونی بۆماسۆنی لەسەردەمی ئیسماعیل خدێوی بوو کورەزای محمد علی کاتێك کە ئیسماعیل پاشا حوکمی میسری گرتە دەست، جولەکەو ماسۆنیەکان دەستیانگرت بەسەر یاسای فەرمانرەوایی میسر وەدەستیان وەرئەدا لە کاروباری ئابوری و سیاسی وولات، ئەوەی کەئاشکرایە ئیسماعیل پاشا لەنێو گەراوەکانی ئەورووپایە وەبەتایبەتی فەرەنسا.

وە ئەنجومەنەکانی ئیتالی چالاك کرد لەمیسر لەسەردەمی خۆی، هەتا هەموو بلاوکراوەکانی ماسۆنی لەمیسر بەزمانی ئیتالی دەردەچوو..

وەئەوەی شایانی باسە ئەسکەندەریە بووە تیکەیەکی گونجاو لەناودەمی ماسۆنیەکان لەهەموو رەگەزەکان، هەتا ناوەندی ماسۆنی لەمیسر تا ساڵی ١٨٧٩ لە ئەسکەندەریە بوو.

هەروەها ئەنجومەنی ماسۆنی فەرەنسی و ئینگلیزی و میسری دەرکەوت لە گشت سەرلنسەری میسر وەدوای ئەوە چالاکی ماسۆنی گواسترایەوە بۆ قاهیرە.

وە چالاکیەکانی ماسۆنی لەمیسر زیادی کرد لەسەردەمی ئیسماعیل پاشا، وەماسۆنیەکان بەرزترین پۆستیان داگیرکرد، کە سەرۆك وەزیران و وەزیران و بەرێوەبەرلن و گەورە کەسایەتیەکان لە میسر لەماسۆنیەکانن لەوانەی کە لە فەرەنسا گەرلنەوە، وەهەموویان نازناوی (پاشا) و (بەگ) و (ئەفەندی) یان پێ بەخشرا.

وەلەنێوان ئەو ماسۆنیانە شازادە حلیم (عبدالحلیم) برای ئیسماعیل پاشا وارسی یاسایی بۆ تەختی میسر بەپێی یاسای ویراسەت کەکارپێدەکرێت لە سەردەمی محمد علی پاشاوە.

وەماسۆنیەکان گرنگیان چرکردەوە لە شازادە حەلیم لەبەرئەوەی گرنگیەکی زۆری ئەدا بەچالاکیەکانی ماسۆنی لەمیسر.. وەخوێندنی لەفەرەنسا تەواوکرد، لە کۆلیژی (سانسیتر) ی سەربازی لەگەڵ ئیسماعیل پاشا وەگەڕایەوە بۆ میسر ساڵی ١٨٤٥ ،وەماسۆنیەکان هەڵیانبژارد بۆخۆیان بە((مامۆستای گەورە)) لەئەنجومەنی ((خۆرهەڵاتی گەورەی ماسۆنی میسری)) ساڵی ١٨٦٧، وەکۆشکەکەی لە شیبرا بوبە ئەنجومەنی ماسۆنی وەجێگری پاشای بەریتانیا لەو ئاهەنگە ئامادەبوو کەلەوکۆشکە ئەنجامدرا.

زۆربەی لایەنگرانی شازادە((حەلیم)) لەماسۆنیە ئیتاڵی و فەرەنسیەکان وجولەکە بوون، وەلەوجولەکە ترسناکانە بوو کە ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ماسۆنی لەمیسر قوتابی شازادە ((حەلیم)) ناسراو بە ((یەعقوب سەنوع)) وە((حسن موسا عقاد)) یەکێك لەگەورە بازرگانانی قاهیرە.

جولەکە چواردەوری ئیسماعیل پاشای داو هەستیکرد کەنێچیرێکی ئاسانە ئەتوانێت تێوەی گلێنێ وەنوقمی بکات لەو زەلکاوەی کە زایۆنیزمی جیهانی نەخشەی بۆداڕێژابوو.. جولەکە بەپەرۆشی ئیسماعیل پاشای قورخ کرد بۆئەوەی قاهیرە وەك پاریسی لێبێت کەتێیدا ژیاوە.

هەروەها ئیسماعیل پاشا بواری کاری میریی گشتی کردەوە لەسەر بەشکردنی لەگەڵ جولەکە، وەبەتایبەتی لە بەشەکان و قەڵەمی ژمێریایەکان و وەرگێر، وەجوولەکە دەسیکردبە بەدیهێنانی ئاواتەکانی لەسەرچاوەکانی سامان و ئاڵتون لەمیسر.

وەلەیەکەمەکانی جولەکە کەکاریان ئەکرد ((فیکتور هراری)) و ((ئیفرایم عادات)) بوون وەبەرزەوەبوون هەتا فیکتور بووبە بەڕێوەبەری گشتی خەزێنەی حکومەتی میسری، وەئیفرام بوو بە چاودێری وەزارەتی دارایی، وە((یعقوب منشە)) دامەزرا بە ئاڵوێرکاری یەکەمی ئیسماعیل خدێوی وەلەگەڵ ((یعقوب قطاوی)) ژورێکیان دامەزراند بۆ ئاڵوێرکاری دراوو بازرگانی وەسەرکەوتنێکی بەناوبانگیان بەدەست هێنا هەتا لەپاشاندا

لێیکی تریان کردەوە لە ئینگلتەرا.

****

پ۱۷۷: ئایا ماسۆن ڕۆژنامەی دەرکرد لە میسر؟

وەلام: جولەکەی ماسۆن یەکەم ڕۆژنامەیان دەرکرد لەسالی ۱۸۷۷، کە جولەکەی ناسراو ((یعقوب صنوع)) بەدەستی هێنا وەناوی نا((ابونظارة)) ڕۆژنامەکەی بەدوای ئەو هاوڕێ جولەکەکەی ((موسا کاستلی)) ڕۆژنامەی ((الكوكب المصري)).

جولەکە ئەوبارودۆخەی قۆستەوە وەڕۆژنامەو گۆڤاری دەرئەهێنا کە خزمەتی ئامانجە سەرەکیەکانیانی ئەکرد کەیارمەتیانی ئەدا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر خاکی فەلەستین، وەلەبەر ئەوەی ((محمد علی)) لەلایەن جولەکەوە دامەزرابوو لەچوارچێوەی تاکەپەراوێزکراوەکانی. وە کوڕەکەی ((عەباسی یەکەم)) کە ((یعقوب قطاوی)) لێی نزیک بووەوەو وەدایمەزراند بە ئالو گۆڕکاری گشتی، وەهەروەها ((ئیسماعیل)) تاکە تاکە دەرگای کردەوە بۆژمارەیەکی زۆر لەجولکە وە هاوکاریانی کرد لە دانووسانی بەدەسهێنانی قەرزی بیانی لە ماڵە گەورەکانی دارایی لەئەورووپا وەک ماڵی ((توبنهایم)) و ((روتشیلد)).

****

پ۱۷۸: ماسۆنی چیکرد لە سەردەمی ئیسماعیل خدێوی؟

وەلام: ئیسمایعیل پاشا پەنایبرد بۆ دارای لێخۆشبوونی لەفەرمان ڕەواکانی ئەورووپا، وە هەریەکێ لەوان سەردانی میسری بکردایە سوزنێکی فیرعەونیەکانی بەدیاری ئەداپێیان وەئەوەش کە ئێستا دەرئەکەوێت لە گۆرەپانی پایتەختەکانی ئەورووپا.

وە ئەرووپا دەستی کرد بەوەی ((ئیسماعیل خدێوی)) بخاتە تەڵەی قەرزەوە، جگە لەوەی کە پلەیەکی بەرزی ماسۆنی بڕیبوو هەتا پێیان ئەووت: پارێزگاریکەری ماسۆنیە لە میسر، وەفەرمانێکی دەرکرد بەپێکهێنانی وەزارەتێك کە ((نۆبار پاشا))ی ماسۆنی سەرپەرشتی بکات کەئەوکەسەیە بەشداریکرد لە نوقومکردنی ئیسماعیل پاشا لە قەرزاری، وەئەوکەسەشە کە ڕێگایدا بە دامەزراندنی ئەنجومەنی ماسۆنی لەمیسر، وەهەروەها سەرپەرشتی هەڵکەندنی ((قەناتی سویس)) ی ئەکرد.

وەئینگلتەرا و فەڕەنسا پیلانێکیان دانا ساڵی ١٨٥٢ بۆ خنکاندنی میسر لە ئابووریدا بۆئەوەی هۆیەك هەبێت بۆ ئەوەی بەریتانیا پەلاماری میسر بداو داگیری بکات لەداهاتوودا بەرامبەر بەویش فەڕەنسا جەزائیر داگیربکات. وەکۆشکی بانقی ئینگلیزی یەکەم قەرزی سەپاند بەسەر میسر بەبڕی سێ ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی بە قانجازێکی زۆر، وە ((ئیسماعیل پاش)) ئەم ئەرکەی سپارد بە جولەکەکانی پسپۆر لە وەزارەتی دارایی بەدرێژایی دوانزە ساڵ، وەسەرکەوتووبوون لەگەڵ بانقەکانی بەریتانی لە چەسپاندنی حەوت قەرزێکەی تر بەسەر میسر .

****

پ٧٩: ماسۆنی چۆن ڕۆڵی بینی لەداگیرکردنی میسر لەلایەن ئینگلیزەوە؟

وەڵام: لەساڵی ١٨٧٥ قەرزی میسر گەیشتە نزیکەی ١٠٠ ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی، کەبوەهۆی دروستبوونی ئیفلاس هێنانی حکومەتی میسر، وەئەمەش بەهۆی دروستکردنی کۆشکی ئۆپرا لەشێوەی ئەوەی کەلە پاریس و ڕۆما هەیە، وە دروستکردنی بیست کۆشك کە لەگەورەترین کۆشکەکانی جیهانە لەوانەش کۆشکی(( عابدین )) و کۆشکی ((قوبە)) وە ((رأس التین)) وە ((المنتزه)) چەندانیتر..بۆمیراتگرتنی کورو کوڕەزاکانی لەدوای خۆی.

قۆستنەوەی جولەکەی ماسۆنی ((دزرائیلی)) سەرۆك وەزیرانی بەریتانیای ئەوکاتە ئەم هەلی دەستبەسەراگرتنی ماسۆنی جولەکە بەسەر کاروباری ئیسماعیل حەدیوی وە بەپیاچونەوەیان بە کاروباری دارایی و ئابووری لە ولات، وەلەبەرئەگای حۆبانەوە ئیسماعیل خدێویان رازیکرد بە پێویستیکردنی فرۆشتنی بەشەکەی خۆی لە پشکی ((قنات سویس)) بەرامبەر چوار ملیۆن جونەیهی ئیسترلینی..

((دزرائیلی)) ئەو جولەکە ماسۆنیەبوو کەواخۆی پیشاندا بە تێکەڵبوونی بە ئاینی مەسیحی لەپێناو وەرگرتنی سەرۆك وەزیران بە پێی دەستووری بەریتانی، وە لەگەڵ فەرنسا رێکەوت کەکاربکات بۆنەوەی کە میصر بداتە دەستەوە بە پەلاماردەرانی بەریتانی بەرامبەر ئەوەی ئینگلتەرا وازلە مەغریب بێنێت بۆ فەرەنسا.

دیزلی بەنهێنی پەیوندیکرد بە((ئال روتشیلد)) لەفەرەنسا وەقەرزی دەسکەوت لێیان بۆنەوەی ئیسماعیل خدێوی نوقم بکات لەقەرزەکانی کەلە رادە بەدەربوو، وە پیلانەکەش ئینگلتەرا دایرشت بەرێکەوتن لەگەڵ فەرەنسا لەسەر ئەو ەی کەمیصر نوقم بکەن لە قەرزاریەك کە بۆی نەدرێتەوە وەئەمەش ئەبێتە هۆیەك کە هێزەکانی بەریتانی بێتەپێشەوە بۆپەلاماردانی میصر، وە((ناتانیل))ی جولەکەی فەرەنسی لەخزمەکانی ((روتشیلد)) هەولیدا لەشێواندنی ئابوری و کاروباری دارایی لەمیصر ((کەولیکرد ئازناوی (بارون)ی پێببەخشرێت لەسەر ئەوکارە شکۆدارییەی)).

وەبەمشێوەیەماسۆنی رۆڵێکی سەرەکی وگرنگی بینی لە داگیرکردنی میصر لەلایەن ئینگلیزەوە زیاتر لەحەفتا ساڵ سامنی ولاتەکەی دزی و وە بوە هۆی دواکەوتنی شارستانی.

- هاورێکەم ووتی: بەراستی گومانم هەبوو لەرۆڵی ماسۆنی لەوەی رویدا لەمیصر لە رووداوەکاریگەرەکانە کەوایلیهات داگیر بکرێت وە ئەوروپا دەستی بەسەرداگرێتە وەدوابکەوێت لەشارستانیەتی، وەئێستاش دڵنیابووم لێی.

پ٨٠: ئایا ماسۆنی ڕۆڵی هەبوو لەلادانی ئیسماعیل خدێوی ؟ وەئامانجی چیبوو لەوە؟

وەلام: بەڵێ ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە نوقم کردنی لە قەرزاری، هەتا ئینگلیز پەیوەندی کرد بە((سوڵتان عبدالحمید)) ی دووەمی عوسمانییەوە وەداوای لێکرد فەرمانێك دەرکات بە لادانی وەئەمەش ڕویدا لە حوزەیرانی ساڵی١٨٧٩ وە توفیق پاشای کوری دەسەلاتی میسری گرتەدەست.

****

پ٨١: ئایا کەتوفیق پاشا بوو بە فەرمان ڕەوای میسر لەدوای باوکی بووە سەرۆکی پایە داری گەورەی هەمیشەی ئەنجومەنی ماسۆنی لەمیسر؟

وەلام : بەڵێ تۆفیق پاشا ماسۆنی بوو وەسەرۆکی پایەداری گەورەی هەمیشەیی ئەنجومەنی ماسۆنی میسری بوو هەتا مردنی لە کانوونی دوەمی ساڵی ١٨٩٣.

****

پ٨٢: کێ سەرۆکایەتی ماسۆنی گرتە ئەستۆ لەمیسر دوای تۆفیق پاشا خدێوی ؟

وەلام: ئیدریس راغب پاشا سەرۆکایەتی ئەنجومەنی ماسۆنی گرتە ئەستۆ لەدوای تۆفیق پاشا لە ٣ی کانونی دووەمی ساڵی ١٨٩٣.

****

پ٨٣: ڕۆڵی ماسۆنی چی بوو لەداگیرکردنی میسر ساڵی ١٨٨٢؟

وەلام: جولەکە پلەو پایەیەکی بەرزی هەبوو وەهەڵکوتانە سەرێکی بەزاتی هەبوو لە یاسای فەرمان ڕەوایی میسر لەڕێگای سەربازە سیخورەکانی زایۆنیزمی جیهانی لەماسۆنیە میسریەکان، وەپێش گەیشتنی هێزەکانی ئینگلیز بۆلێدانی ئەسکەندریە

ماسۆنیەکان کۆبوونەوە لە میسر بەسەرۆکایەتی ((محمد سلطان پاشا)) ی ماسۆنی یەکەم سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەرانی میسری، وەژمارەیەك لەماسۆنیە میسریەکان کەخاوەن لاپەڕەی ڕەش بوون وەك ((محمد بەگ شواربی)) و ((عبدالشهید بطرس أفندی)) و ((عبدالسلام بەگ مویلجی)) وەچەندانیتر.

کۆبوونەوە بەنهێنی بۆدیاریکردنی پلانێك کەپێویستە جێبەجێبکرێت بۆ یارمەتی هێزەکانی بەریتانی بۆ داگیرکردنی میسر، وە ڕێنیشاندانی بۆ گونجاوترین ڕێگا کە ئەیانبات بۆچوونە ناو قاهیرە، وە شازادە ((علی یوسف خنفس)) یان ڕاسپارد کە هەستێ بە هاوڕێیەتی هێزەکانی بەریتانی وە دەورەی سوپای مسری بدات لە((کفر الدوار))، کەبوەهۆی کوشتنی دەیان هەزار لە سەربازەکانی میسر.. هەروەها شازادە((عبداالرحمن حسن)) ڕاسپێردرا بەگۆڕینی جێگاکانی پاسەوانی میسری لە ((تل الکبیر))، وەلەوێوە هێزەکانی غازی هاتنە پێشەوە بۆ قاهیرە.

((محمد سلطان)) باوکی ((هدی شعراوی)) یە کەزۆر کاریگەری تێکرد بیرو باوەڕەکانی باوکی،وەکەئێستا پێی ئەوترێ ((سەرۆکی بزوتنەوەی ئافرەتان لە میسر)). وەلە ئەنجامی ناپاکیەکانی ((محمد سلطان)) دژی سوپای میسری ماسۆنیەکان خەلاتیان کرد هەتا وایلێهات لە هەموو دەوڵەمەندەکانی میسر دەوڵەمەندتربوو..

وە لەڕۆژی ١١ تەموزی ساڵی ١٨٨٢ بیناکانی ئەسکەندەریە وێران ئەکرا وەخەڵکەکەی ئەکوژرا بەگوللەی تۆپەکانی گەشتی گەلی دەریایی ئینگلیزی لەژێر هێرشێکی دڕندانەی کوێرانەی نامۆ بۆسەردانیشتوانی شارەکە.

عیلمانیەکان و ماسۆنیە خیانەت کارەکان ئامادەبوون لەلایەن خۆیانەوە ڕاوەستن لەگەڵ گەورەکانیان بۆپەلاماردانی میسر، وەیەکێك لەپیلانەکانیان کەدایانڕشتبوو بۆناپاکیکردنی سوپای میسری و شلەژاندنی ئاسایش و یەکەکانی سوپای میسری

لەئەسکەندەریە، وەهەستان بە کردنەوەی ئاگر لە گەرەکە شەعبیەکان لەناوشار، وە سەرسامکردنی گەرەك بەم ئاگرە وە کۆمەڵێکی تری ناپاك لە هۆزەکانی عەرەب کە پێیان ئەوترا ((منداڵەکانی عەلی)) هەستان بە سوتاندنی گەرەکە بیانیەکان لەناوشارەکە.

وەسەرەرای ئەم هەموو ناپاکیە یەکەکانی سوپای میسری سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لە ((کفر الدوار)) هێزەکانی سوپای پەلاماردەری بەریتانیان ناچارکرد کە ئاراستەی خۆی بگۆرێت بۆ ((التل الکبیر)).

تۆفیق پاشای خدێوی فەرمانێکی دەرکرد بەلادانی ((ئەحمەد عەرابی)) بەمەبەستی شڵەژاندنی ریزەکانی سوپای میسری، بەڵام گەلی میسر ئەزهەری پیرۆز پاڵپشتیانی ئەکرد وە دژی فەرمانەکە وەستانەوەو پاڵپشتی ((احمد عرابی)) بوون.

وەدەرئەنجامی ناپاکیەکانی ماسۆنیە میسریەکان دژی سوپای میسری لە ((کفر الدوار)) و ((التل الکبیر))، ئینگلیز توانیتی سوپای میسر بشکێنێت.

وەهێزەکانی ئینگلیز چوونە ناو قاهیرە وە((عرابی)) و سەربازەکانی خۆیاندا بەدەستەوە، بالیۆزی بەریتانیا((دافرین)) لەقوستەنتینیەوە ئامادەکرا بەتایبەتی بۆ ئەوەی بچێتە قاهیرە لە رۆژی سەرکەوتن کە((تۆفیق پاشا خدێوی )) ئاهەنگی بۆگێرا لەگەڵ سەرکردەی هێزەکانی بەریتانی ((سیمۆر)) لەئاهەنگێکدا بۆ خەڵاتکردنی ماسۆنیە عیلمانیە میسریەکان کە ئەرکەکانیان بەجێهێنابوو وەك سەرۆکە زایۆنیزمیەکانیان وە ناپاکیان لە وڵات و نیشتمانیان کردووە، وە محمد سلطان نازناوی ((سیر)) ی پێبەخشرا وەهەریەك لە ((الشواربی)) و ((السیوفی)) و ((المویلحی)) نازناوی پاشایان پێبەخشرا.. جگەلە دیاری و بەخشیی گەورە، وەخەلاتکردنی خدێوی بەسەر ٦٠ ئەفسەری ئینگلیز، وەبەم شێوەیە میسر داگیرکرا بەهۆی ماسۆن و هاوپەیمانەکانی ساڵی ١٨٨٢ زایینی.

داگیرکردنی میسر لەلایەن بەریتانیاوە ساڵی١٨٨٢ بەسەرتای پەیمانی نوێی جولەکەو

ماسۆنیەکان دادەنرێت وەخـاڵ وەرچـەرخانە بـۆ چـالاکی زایـۆنی جیهـانی لەمیسـر.. وەپێشکەوتنێکی خێرایە بۆجولەکە بۆبلاوبەنەوەو گەشەسەندنی دارایی و ئابوری.

وەکۆچکردنی جولەکە بەرەو زیادبوون چوو لـەدوای داگیرکـردن بەشـێوەیەکی ترسـناك بۆبوتاندنەوەی میسر ی نێچیری بـەنرخ، وەکۆچـکردنی جولەکـەی ئـەورووپا بۆمیسر وە ژمارەیان لە ٦ هەزارەوە سالی ١٨٤٠ بازیدا بۆ٣٠ هەزار سالی١٨٨٣.

چالاکی ماسۆنی زیادیکرد لەمیسر بەزیادکرنێکی ترسناکانە وەجولەکە دلنیابوو لـەوەی ئێستا میسر پردێکی گونجاوە بۆ بازدان بۆ فەلەسـتین، وەکەوتنەژێردەسـتی ئینگلیـز ڕێ ئاسانکاریە بۆ گەیشتن بۆ فەرمان ڕەوای عوسمانی، وەلێك گەیشـتن لەگـەلیا بـەکرین یـان بەکرێگرتن، وە هەردوو ئـاوارەی جولەکـەی لـە ئەسـکەندەریە و لەقاهیرە ڕۆلێکـی گـرنگ ئەبینن لە دامەزراندنی دەولتی ئیسرائیل.

ئـەوەی شـایانی باسـە ئـەوەی لەسـالی ١٨٨١ کەپلـەی مامۆسـتای وەرگـرت ((لەئەنجومەنی گەورەی ماسۆنی نیشتیمانی میسـری)) پیـاوێکی ئـەورووپی کـە رەگـەزو ناسنامەی نەزانراو بوو بـە ((دیـونیس موبولـو)) ناسـراوبوو وەبـەردەوامبوو لەپۆسـتەکەی هـەتا سـالی ١٨٨٨، وەتوفیـق خـدێوی هـەلی بـژارد بـەجێگری دوای خـۆی لەبـەر کـارە چاکەکانی بۆماسۆنیەت.

****

پ٨٤: ئیدریس ڕاغب بەگ کێیە کە بەرزکرایەوە و سەرۆکایەتی ئەنجومەنی ماسۆنی ئەکرد لە میسر وەمامۆستا بوو لەپلەی ٣٣؟

وەلام: ڕاغـب بـەگی بـاوك لەسـالی ١٨٦٢ لـەدایك بـوو، دامـەزرا بـە دادوەری دادگـا ئەهلیـەکان .. وەبـاوکی پیـاوێکی یۆنـانی یـان قوبرسـی بـوو وەناسـنامەی نەناسـراو بـوو وەهیچکەسێك ناوی ڕاستەقینەکەی نازانێت، بەلام لەمیسر نـاوی خـۆی نـابوو (ئیسـماعیل

راغب) وە ئەیان ووت یان جولکەیە یان مەسیحی وەلەژێر ئەوناوە شاردرابوەوە، لەگەڵ جولەکە دەورێکی زۆریان گێرا لەسەردەمی ئیسماعیل پاشا پلەو پایەی بەرز کرایەوە وەبەشێوەیەك هەڵیخەڵەتاند کە پلەی پاشای پێبەخشی وە ئیسماعیل پاشا بەرزکرایەوە بۆ پۆستە بەرزەکان هەتا بووبە سەرۆکی ئەنجومەنی شورا لەسەردەمی ((ئیسماعیل)) هەتاگەیشتە ئەو دۆخەی بووبە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لەسەردەمی ((تۆفیق پاشا)) دوای داگیرکردنی میسر لەلایەن ئینگلیزەوە.

بەپاڵپشتی جولکەو ماسۆنیەکان و کۆشك و هێزی داگیرکەر ((ئیسماعیل پاشا راغب)) سەروەتێکی بێشوماری کۆکردەوە لە کۆشك و زەوی وزارو شوینە بازرگانیەکان و... هیدیکە.

کاتێك کەمرد ((ئیدریس ڕاغب)) ی کوڕی سامنێکی بێشوماری بۆ مایەوە لە باوکی وە وەبەخشیتی لە خزمەتی چالاکی ماسۆنی لەمیسر، زۆر بەپەرۆشەوە بوو بۆ چالاکی زایۆنی، وەحەزوبیرۆکەی بێهاوتاو نامۆی هەبوو وایلێکردبوو گیانی دابنێت بۆ سەرگەورە زایۆنیزمیەکانی، هەتا گەیشتە پلەیەکی سەرقاڵ کەوایلێکرد پۆستی ((مامۆستای گەورە)) بەدەست بهێنێت کە ئەوکاتە تەمەنی نزیکەی سی ساڵان بوو، وەلەوکاتەی کە ئەم پۆستەی وەرگرت یەکسەر هەستا بەدانەوەی قەرزی ((ئەنجومەنی ماسۆنی گەورەی نیشتیمانی میبسری)) وەخەزێنەکانی کردەوە بۆخزمەتی ئەنجومەن و چالاکیەکانی، وەتوفیق خدێوی دایمەزراند بە بەڕێوەبەری بەڕێوەبرایەتی شاری قلیوبیە.

وە((راغب بەگ)) بەپەرۆش بوو بۆ ماسۆنیەت وەئەنجومەنێکی گەورەی کردەوە لەپلەی مامۆستایانی فێرکاران.

****

پ ٨٥: گرنگترین چالاکیەکانی ئیدریس راغب چین کە کاروباری ماسۆنی بەرزەوەکرد؟

وەڵام: ئیدریس راغب ئەنجومەنێکی ماسۆنی نوێی دامەزراند بەناوی شاری ((بنها)) پایتەختی قلیوبیە ئەنجومەنی ((بنها)) یە وەلەبەهێزی چالاکیەکانی ژمارەی ئەنجومەنی ماسۆنی لەکاتی گرتنەدەستی سەرۆکایەتی ئەنجومەن لە دوای توفیق پاشا گەیشتە ٥٤ ئەنجومەنی ماسۆنی، وەگەیشتە نرخاندنی ماسۆنی جیهانی بۆدڵسۆزی کە دووئەنجومەن دامەزرێنێت یەکێکیان ((ئەنجومەنی ئیدریس)) وەئەویتر ((ئەنجومەنی راغب)) واتە دووئەنجومەن بەناوی ئەوەوە وەئەوەش رووینەداوە لەهیچ کەسێکیتر لەوەوپێش.

وەلەسەر حسابی خۆی رۆژنامەیەکی دامەزراند بەزمانی ماسۆنیەوە، وەچالاکیە بەگومانیەکانی ئەوپیاوەی راکێشا بەدامەزراندنی — لەدەرەوەی بواری ماسۆنی — حیزبێکی سیاسی ناوینا ((حیزبی دەستووری)) وەلە گرنگترین بەندەکانی داوا دەکات بۆ جیاکردنەوەی چینایەتی وەرانەیەیت بەژیانی نوێنەرایەتی.

****

پ٨٦: ئەو پۆستانەی کە ئیدریس راغب گرتیە ئەستۆ لە ماسۆنی چی بوون؟

وەڵام: ئیدریس راغب سەرۆکایەتی ئەنجومەنی ماسۆنی گرتەئەستۆ وەکاری کردووە لە پۆستی مامۆستای گەورە دوای مردنی ((تۆفیق پاشا)) هەروەك باسمانکرد لەساڵی ١٨٩٣ هەتا ساڵی ١٩٢٢، واتە٢٩ساڵ سەرۆکی ئەنجومەنی ماسۆنی میسری بوو، وەلەسەردەمیدا کاروباری ئەنجومەنی ماسۆنی بەرزەوەبوو لەمیسر هەتا بووە هێزی نهێنی چاودێر لەسەر باسای فەرمانرەوایی لەمیسر، بۆیە ماسۆنیەکان داوایانکرد پێی بوترێت ((سەری دەسەڵاتی ماسۆنی)) بەسەرۆکی ئەنجومەن لەوکاتەدا، وەئەمانە هەمووی بەنهێنی ڕوودەدات بەشاراوەیی وەهیچکەس لەمیسریەکان هیچیان لەبارەی ئەمەوە نەدەزانی.

((راغب بەگ)) لەوکەسانە نەبوو کەحەزەکەن لەژێر ڕووناکیەوە دەرکەون، بەڵکو وەك

شەمشەمە کوێرە لەتاریکی کاری دەکرد، وەگیرەکانی هەمووی گومانداوی بوو لەنێوان ڕاستی و گوماندا خۆی دەشاردەوە.

لەدوای مردنی (ئدریس راغب)) حکومەتی میسری هەستا بە زیندوو ڕاگرتنی ناوەکەی، وەیەکێ لە شەقامە زیندوەکانی ناوچەرگەی قاهیرەی بەناویەوە ناونا کەلقێکە لە شەقامی رەمسیس، وەهەتا ئێستاش ناوەبەناوی ((شەقامی ئیدریسراغب بەگ)).

****

پ٨٧: کێ سەرۆکایەتی ماسۆنی گرتە ئەستۆ لەمیسر دوای ئیدریس راغب پاشا؟

وەڵام: شازادە محمد علی کوری توفیق پاشا (کە پشتگیری سەردەمی فاروق پاشا بوو) سەرۆکایەتی ئەنجومەنی ماسۆنی گرتەئەستۆ لەساڵی ١٩٢٢ بۆ ساڵی ١٩٢٨زا ، وەدەستی لەکار کێشایەوە، دوای ئەو ماسۆنیەکی تر هات بەناوی محمود فهمی قەتەری کەدووساڵ لە پۆستەکەی مایەوە، وەلەدوای ئەو ئەحمەد ماهر پاشا هات ساڵی١٩٤٥.

****

پ٨٨: ژمارەی ئەنجومەنەکانی ماسۆنی گەیشتە چەند لەمیسر؟

وەڵام: ژمارەی ئەنجومەنەکانی ماسۆنی لەمیسر ساڵی ١٩٥٧ گەیشتە نزیکەی ٦٨ ئەنجومەن، دینداریان ئەکرد بەدڵسۆزی بۆ ئەنجومەنی سەرەکی لە ئەسکەندەریە کە لە گەرەکی اشەقامی طوسون بوو.

٣٣ئەنجومەنی لە ئەسکەندەریە بوو وە ١٨ ئەنجومەنی لە قاهیرە بوو وە ١٠ ی لە پۆرسەعید وە ٢ لە مەنصورە وە٢ لە ئیسماعیلیە وە یەکێك لە شاری (محلە الكبری) وە یەکێکیش لە فەیوم وە یەکێکیش لە ئەلمەنیا بوو.

وەبەناوبانگترینیان پەرستگای (جریسە) کەلە مەیدانی تەحریر بوو وەپەرستگای (کوکب الشرق) لە عەتبە،وەئەنجومەنی (لەنشیر) لەشەقامی شامبلیون بوو، وەئەنجومەنی بەسیونی لەسەرەتای شەقامی محمود لەقاهیرە.

وەهەموو ئەوئەنجومەنانەداخرا ساڵی ١٩٦٤ دوای ئاشکراکردنی لەلایەن سەرۆك جمال عبدالناصر کە ماسۆنی پەیوەندی هەیە بە زایۆنیزم و ئیسرائیل.

****

پ٨٩: دوای میسر چی وولاتێکی تر ماسۆنی تیایدا بلاو بوەوەو دەستی بەسەرداگرت؟

وەلام: لبنان.

****

پ٩٠: کەی ماسۆنی چووە ناو لبنانەوە؟ وەچی کرد؟

وەلام: ماسۆنی لەساڵی ١٨٦٠ چووە ناو لبنانەوە لەچوارچێوەی خۆرهەلاتی گەورەی فەرەنسی کە چەند ئەنجومەنی بۆدامەزراند. وەبەردەوام بوو لەکارکردن تا ساڵی ١٩٦١.

خۆرهەلاتی گەورەی فەرەنسی دووبارە گەڕایەوە وە دووئەنجومەنی دامەزراند ساڵی ١٩٩٧.

بەلام لەسەرەتای سەدەی بیستەم ئەنجومەنی گەورەی ناوخۆیی دەرکەووت، وەدەسلاتی بێگانەی تر چووە ناویەوە وە ئەنجومەنی دامەزراند لە لبنان وەکاریگەری کردەسەر هەموو ئەو ئەنجومەنانە بەشێوەیەکی خۆش گوزەرانی بەقازانجی ماسۆنی بەگشتی.

سەربەخۆیی لبنان بوە پاڵنەری سەربەخۆیی ئەنجومەنەکانی ناوخۆیی. وەنەمانی ترس

وە زیندوویی چالاکییەکانی وە دەرکەوت دەسەڵاتەکانی ماسۆنی لبنانی بێلایەنە وەیەکسانیش خزمەتی گەورەی لوبنانی. وە لبنان گەشەی سەند لەڕووی ماسۆنییەوە دەرکەوتنی دەیەمەتی فیکری لە پیاوانی راست و کۆمەڵ ئەوانەی کە چوونە ناو ئەنجومەنەکانەوە وە تۆمەکانیان کۆنووس کران لە چەندین پێداچوونەوە، وەلەهەموو گەورەیەکتسد وەکانی ئەنجومەنی ماسۆنی راستەوەستا لە لبنان. وەئەمڕۆ ماسۆنی ئەمێستا دەستوورێکی چالاک و بەبەرهەمە، وە هەر هەڵگری مەشخەڵی برایەتی و هیگریکردن و کردمن بۆ ئەریتەکان کە مێژووەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەدەها ساڵ.

ئەمڕۆ ئەنجومەنەکانی ئیشتیمانی و ئەنجومەنەکانی بیانی پەیوەندی برایەتی یان بەرپرسیان ئەگێڕنەوە ئەمیان خۆیاندا هەروەها کردنەوەی ماسۆنی لوبنان بۆ ماسۆنی جیهانی بەشداریکردن بووە بۆ گەشە پێکردنی و دەوڵەمەند کردنی.

وە ئەوەی تێبینی کەوتەوەتە لە لبنان لە شەڕی ناوخۆیی و تیرۆرکردنی بەردەوام لە کەسایەتیە سیاسییەکان و کتێبەکان لەپشتی ماسۆنییەوەیە.

****

سعد زغلول





محمد علي باشا 1805-1848 م



ئیسماعیل خدێوی



محمد عبده



# ماسۆنی و مەسیحی دەجال

ــ بەکورتی مەسیحی دەجال کێیە؟

ــ گرنگترین هێمای دەجال کە ئاشکرایە لە هێمای ماسۆنی.

ــ یەك چاو وە بەڵگەکانی لەماسۆنیەتدا.

ــ هەوڵی ماسۆنی بۆ ئاهەنگ گێڕانی ڕۆژی ١١/١١/٢٠١١ لە ناوچەی هەرەم لە جیزە.

هاوڕێکەم هات بۆلام کە هەندێ پرسیاری پێبوو لەسەر پەیوەندی مەسیحی دەجال بە ماسۆنی جولەکەوە وە ووتی: لەم دواییەدا لەسەر دەجال خوێندمەوە کە لە سەر نیشانەکانی ڕۆژی دوایی بوو، ئایا پەیوەندی هەیە لەنێوان دەرچونی دەجال کۆتایی دنیا وە ئەوەی کەئێستا ماسۆنی ئەیکات لە وپیلانە وێرانکاریانە بۆ گشت جیهان، وەلەپێشدا ئەمانەوێت تیشکێك بخەیتە سەر کەسایەتی مەسیحی دەجال بەکورتی، وەپرسیارەکەش ئەمەیە:

پ٩١: مەسیحی دەجال کێیە بەکورتی؟

وەلاٌم: زۆرنوسراوە لەسەر نیشانە گەورەو بچوکەکانی ئاخرزەمان وەلەسەر مەسیحی دەجال بەباسکردنی لەنیشانە گەورەکان، وەلەپشت ئەوانەی کەڕوو ئەدات لە پیلان و شەڕە وێرانکاریەکان لەجیهان، بەکورتی هەندێ تیشك ئەکەمە سەری، وەکێ زیاتر ئەیەوێت بزانێ با سەیری ئەو سەرچاوانە بکات کەباسی لێوەدەکەن.

مەسیح ی دەجال کە ناونراوە مەسیح لەبەرئەوەی چاوێکی نیە، وەئەم ناوەش بەمشێوەیە پێکهاتووە لەناوی (فاعل) ـ بکەر ـ واتەسڕاوەتەوە بەپێچەوانەی مەسیحی کوری مریەم کە ناوی پێکهاتبوو لەناوی ( الفاعل الماسح ) واتە لابەر لەبەرئەوەی نەخۆشی لائەبرد لەسەر نەخۆشەکە وە نەخۆشەکە بەویستی خودا چاك ئەبوەوە.

وەووتراوە: لەبەرئەوەی (دجل) واتە داپۆشی وەك ئەڵێن (دجل الاء ناء بالذهب) واتە دەفرەکەی ڕوپۆشکرد بەئاڵتون وەلەبەرئەوەی ئەم دەجالە سەرزەوی دائەپۆشێ بە بێباوەڕی، وە گەشتێکی درێژ ئەکات بەماوەیەکی کەم، وە دەجال یەکێکە لەنیشانەکانی قیامەت وەپێغەمبەرمان ﴿ﷺ﴾ فەرمویەتی ((قیامەت هەڵناسێت هەتا ئەم

ده نیشانەیە ڕوونەدات :(( دووکەڵ و دەجال و داببە و هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواو...
ئاکۆتایی فەرمودەکە)).

هەروەك ئەیزانین نیشانەکانی دوارۆژ هەیە بچوکە و هەیە گەورەیە وەنیشانەکان دەستی پێکرد بەهاتنی پێغەمبەرمان ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ وە لە نیشانەکانی گەورەش دەجالە وەپێغەمبەرمان ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ فەرمویەتی (( سێ شت ئەگەر رویدا باوەڕهێنان سودی نابێت ئەگەر ئەو کەسە لەپێشدا باوەڕی نەهێنابێت ئەوانەش: هەڵهاتنی خۆر لە ڕۆژئاواوە وە دەجال وەداببە، ئەگەر خەڵکی لەو کاتەدا ئامادە بوبێتن بۆ هاتنی وەباوەڕیان پێنەهێنابێت ئەواباوەرەکەیان سودی نابێت کە دەجال هات وکەوتە ناو ئەوفیتنەیەی کە تێی دەکەوێت ، وەئەم فەرمودەیەش ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتەی کە خودا ئەفەرموێت:

﴿ يوم يأتي بعض ءايات ربك لا ينفع نفسا إيمانها لم تكن ءامنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيرا قل انتظروا إنا منتظرون ﴾ [الأنعام، ١٥٨].

مەبەست لەم فەرمودەیەی خودا ﴿ بعض ءايات ربك ﴾ دەجالە وەئەمەش وەڵامی ئەوکەسانەیە کەئەڵێن بۆچی دەجال ناوی نەهاتووە لەقورئاندا؟ بۆیە ئەڵێین: ناوی هاتووە تیایدا وەهەروەها پێغەمبەرمان ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ گەلەکەی ئاگادارکردووەتەوەو فەرمویەتی (بادر بالأعمال ستا) واتە دەستپێشخەری لە شەش شتدا کەن وەلەو شەشەدا ناوی دەجالیش هاتووە.

بوخاری ئەیگێڕێتەوە لە ابن عمر(خوالێیان رازیبێت) ئەڵێت: پێغەمبەری خودا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ فەرمویەتی من ئێوەم ئاگادارکردوەتەوە وەهیچ پێغەمبەرێك نیە گەلەکەی

خۆی ئاگادارنەکردبێتەوە، بەلاّم قسەیەکتان پێئەڵێم کەهیچ پێغەمبەرێك ئەوقسەیەی بە گەلەکەی نەوتبێت : ئەو ــ واتەدەجال ـ یەکچاوی هەیە، بەلاّم خودا یەك چاو نیە.

****

پ٩٢: ئامارەت دابەوەی کە هەرەمی ماسۆنی یان سیگۆشەو دەجال لەسەرەوەی چاوێك هەیە ئایا پەیوەندی فیرعەونەکان چییە بە دەجال؟

وەلاّم: پەیوەندیەکی بەلگەدار هەیە لەنێوان هێماو شێوەکانی فیرعەونی وە مەسیحی دەجال وەماسۆنی جولەکەکراو.

وەپەیوەندی فیرعەونیەکان بە ماسۆنی و هێما لێکچووەکانی نێوانیان، فیرعەونیەکان لەپەرستکارەکانی دەجالن وەئەمەش رویدا لە چوارچێوەی یەککرتنی پێشوونانیاندا وەئەوانەی خۆیان ئەپاراست لەدەجال نەك تەنها پێغەمبەری خوا یوسف کاتێك کە لەمیسر جێگیر بوو ساڵانێکی درێژ ئەوو یە عقوب سەلامی خوایان لێبێت، وەهەروەها نەك لەپێغەمبەری خودا موسا سەلامی خوای لێبێت بەڵکو هەروەها لە پێشونانیانیش، وەدوای ئاگادارکردنەوەیان شەیتان بردیانی بۆئەوەی کە خۆی بپەرستن لەگەڵ خودایکی تر ، وە دەجالیان ناونا بەخوای یەك چاو کە هەموو شتێك ئەبینێت، وە هێمای یەك چاو لەسەر زۆربەی شوێنەوارو هەرەم و هەروەها سێگۆشەکانیان ئەبیندرێت.

****

پ٩٣: ئەمەویێ باسی یەك چاوو بەلگەکانی لەناو ماسۆنی بکەیت بۆمان؟

وەلاّم: هێمای یەك چاو تەنها بۆ کەنیسەکان و پەرستگاکانی جولەکە نیە بەڵکو لە

دروشمی وولاته یەکگرتووەکانی ئەمەریکی کەلەگەڵ هێمای هەرەمدا پێکەوە ئەبینرێن وەهەروەها لە دراوی یەك دۆلاری ئەمەریکی ئەبینرێت کە یەکچاو لە سەروی هەرەمێکەوەیە کە ماسۆنیەکان بڕوایان وایە کە ئەوچاوەیە کە هەموو شتێك ئەبینێت، وەهەروەها لەدروشمی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەستێرەی شەش تیشکی لەسەرە کە بریتیە لە یکتربڕینی دووهەرەم، وەهەموونەو هێمایانە هێمای ماسۆنیە، بەڵکو سەرسام دەبیت کە ئەو هێمایانە ئەبینیت لەکۆمپانیا گەورەکانی پرۆگرامەکانە وەك ئەدوب فۆتۆشۆپ و نیڤادا، وەکۆمپانیاکانی خۆراك و کۆمپانیاکانی جگەرە، بەڵکو بە هێمای پەنجەکانیان کەوەك دروشاخ پیشانی ئەدەن کە بەبەرزکردنەوەی هەردوو پەنجەی تونەو دۆشاو مژە وە نوقاندنی بڕلوتەو بالابەرزە وەمەبەست لەم هێمایە خوای ماسۆنیە، کەئەویش شەیتانە. وەهەموو ئەو هێمایانەئامازەیە وەئامادەبوونە بۆ هاتنی مەسیحی دەجال، وەبەڵگەی دەستبەسەرلگرتنی ماسۆنی دەجالیە بەسەر هەموو کارەکان لەجیهان.

دەستووری ماسۆنی ئامارە بەوەئەکات کەماسۆنی بەمشێوەیەی هاوچەرخیانەی ئەوە درێژ بونەوەی سەردەمی کۆنە لە کتابی پیرۆز وەئەو جولەکانەی کە میسریان بەجێهێشت گەڵ موسا یەکەم دەوڵەتی ماسۆنیان پێکهێنا.

وەهەندێ قسە هەیە کە مەسیحی دەجال خۆی سەرۆکە، وەلەبەر ئەمە هێمای چاو لە هەموو دروشمەکانیدا هەیە، کەوا مەسیحی دەجال یەکچاوی هەیە. وە هەروەها ئامارەشە بۆ حکومەتی ئەمەریکا، کەلەسەرکردەکانی ماسۆنی جولەکەن بەتایبەتی ئەندامانی کۆنگریسی ئەمەریکی. ماسۆن ئەڵێت: ئەوچاوە (( ئەوچاوەیە کەهەموشت ئەبینێت))، وەئامارەدەکات بەو بیروبڕوایەی کەخودا ئەتوانێت توانایەك بەبینینی بدات

که قولایی دڵ و نەفسی مرۆڤیش ببینێت.

جگە لەوەی توێژەرەوەکان لەڕاستی دڵنیان لەسەرئەوەی کە ئەوچاوە چاوی خودانیە یان ئەندازیاری گەورەی ماسۆنی هەروەك بانگەشەی بۆدەکەن ، بەڵکو ئەوە لە ڕاستیدا هەر چاوی شەیتانە کەوا هەوڵدەدەن لەچوارچێوەی چالاکیەکانیان دەسبەسەر هەموو جیهان بگرن وادەکات ((هەموو شت ببینن لەژێر زاڵبونیان بەسەر جیهان)).

((مایکڵبینسۆن)) ی نووسەر لکتابەکەیدا (لەناو کۆمەڵە نهێنیەکان) ئەڵێت: هێمای چاو کە دەردەکەوێت لە لوتکەی سەر سێگۆشەکەی لەبان مۆری گەورەی وولاتە یەککرتووەکان وەلەسەر دراوی کاغەزی یەك دۆلاری ئەمەریکا، وەئەو ووشانەی نووسراوە، ئاماژەیە بۆ دەسبە سەراگرتنی ماسۆنیەکان بەسەر وولاتە یەککرتووەکان وەلە سەر ویستی خۆیانن بۆ دەسبەسەراگرتنی هەموجیهان، بەوبۆچونەی کە کێ دیزاینی خەتمەکەی دانا وەوێنەو ووشەی دانا پێشینەیەکی ماسۆنی هەیە.

وەچاوەکەو هەرەم درووشمە لە دروشمەکانی ماسۆنی، لەبان چاوەکە ڕاستەوخۆ بڕگەیەك ئەبینین نووسراوە (annuit coeptis ) واتە گەورەی سەرکەوتو یان میسری گەورە یان ئەنگوستیلەی قیبتی وەلەزمانی فرەنسیدا بەواتای قیبتی گەورە.

لەژێر هەرەمەکەدا ڕاستەوخۆ نووسراوە( Novus ordo Seclorum ) وەولتای پیتی (یاسای جیهانی نوێ ).

وە لژێریشەوە نووسراوە ( The Great Seal ) واتە ئەنگوستیلەی گەورە.

****

پ٩١: زانیمان لە ماوەی ڕابردوو بەدەرکەوتنی ئاشکرای ماسۆنی لەمیسر وە پێداگیری کردنیان لەگێرانی ئاهەنگێك لە بەردەم هەرەمی گەورە لەمیسر ڕۆژی ٢٠١١/١١/١١ زاینی، بۆچونی تۆ چییە؟

وەلام: بەڵێ ((ماسۆنی)) و (( کابالا)) ی جولەکە هەوڵیان دا بەگێرانی ئاهەنگێکی تایبەتی لە ناوچەی هەرەم ئێوارەی ڕۆژی هەینی ٢٠١١/١١/١١، بەووتنی هەندێ درووشمی ئاینی بەسەر هەرەمی خۆفۆی گەورە.

((دکتۆر ئەندرۆ فیتکیفتش)) یەکێك لە ئێردراوە شوێنەوار پشکنێرەکان ئەڵێت، ئەدوا بۆیان دەربارەی بیروباوەڕەکانی ئەم نوێنەرانە وەگرنگی ڕۆژی ١١/١١، وەبەهیوابونی بۆ ئەو ئاهەنگەی بڕیاردراوە بگێردرێت لە هەرەمدا:

((بەشداربوانی ئاهەنگەکە هێزێکی خۆشەویستی ئەنێرن بچێتە لاشەی هەرەمی گەورە، بۆئەوەی تێکەڵبێت لەگەڵ هێزی خۆی دوبارە بلاوکاتەوە بەهۆی ((کریستالی ئالتونی)) کەزەوی ئەپارێزێت )) کە بۆئەم مەبەستە درووستکراوە، وەژمارەیان ١١کریستالە، یەکێکیان سەردەمێکە دروستکراوە وەپارێزراوەلە میسر لە شوێنێکی پارێزراو، وەیەکێکیتریان دروستکراوە تایبەت بەئاهەنگی ٢٠١١/١١/١١ کە لەهیندستانە.

((فیتکیفیتش)) باسی فیکرەی ((کریستالی ئالتونی)) دەکات کە بریتیە لە دوو هەرەمی هەلاوگێڕ لەیەکتری بەشێوەی ئەستێرە، وەبڕیارە بکرێتە بان لوتکەی هەرەمی خۆفۆ، بۆدەسپێکردنی مەراسیمی ئاهەنگی ٢٠١١/١١/١١ لەکاتژمێر ١١ی سەرلەبەیانی هەمان ڕۆژ وەدوو پیاوو دوو ژن ڕانەوەستن لە چواردەوری هەرەمی خۆفۆ، وەلەکاتژمێری ١١ی

شەوی هەمان رۆژ چوار لەگەورەترین پیاوانی ماسۆنی ئەچنە ژووری نێژراوی پاشا خۆفۆ بۆ ووتنەوەی ووتاری تایبەتی وە دامەزراندنی ((کریستالەکە))، بەلام زیاتر لەهەزار کەس دەستیان گرتووە بەبازنەیی بەچوار دەوری هەرەمدا.

وەئەندامانی نیردراوی هۆلەندی بەشداری ئەکەن لەگەوجێتی بێئاقلیانەی ((١١/١١)) کەکۆمەلێك سۆفی جوولەکەن پێیان ئەوترێ ((کابالا)) کە ناسراوە بە پەیوەندیەکی پتەو بەماسۆنی، وەبەبڕوای ئەو ئەوخراپە کاریەی ڕوئەدات لە جیهان ئەنجامێکی سروشتی دورکەوتنەوەیە لە خودا، وەئەم کۆمەڵەیە هەوڵ ئەدات بۆ سەلماندن کەفێری هونەری جادوو کردن و چاوبەستن بوونە لەمیسری فیرعەونی، وەبروای وایە کە کۆتایی جیهان سالی داهاتوو دەبێت، وە مەسیحی دەجال دێتە سەرزەوی لە ماوەی ((١١/١١/٢٠٩١ وەتاکۆتایی سالی ٢٠١٩))، وەئەو ماوەیەش تەنگ و چەلەمەیەکی زۆر ئەبینرێت لەجیهاندا.

لەبەرئەوە ((کابالا)) پیلانێکی دانا بۆ دەسبەسەراگرتنی کاروباری جیهان لەم ماوەیەدا، وەئەوەش هەولدانی پێك گەیشتنە لەگەل (( فریشتەکانی خوارەوە))، لەرێگای ((تیشکی هەرەمی گەورە))، کەبە دەروازەی هاتوچۆی خواوەند دائەنرێت، وە((کابالا)) وای دائەنێت رۆژی ((١١/١١)) هێزێکی نوێیە بۆ بێدار کردنەوەی جیهان.

بەلام بەبەخشندەیی خودای گەورە ئەوە ڕوی نەدا کە ماسۆن ئەیویست، وەئاهەنگە کەیان هەلوەشایەوە دوای ئەوەی پیلانەکانیان ئاشکرابوو بۆ بەرپرسەکانی میسر وەسوپاس بۆ خودای بەهێزوو توانا.

****

پ٩٥: لە هەموو ئەمانە واتێدەگەین کەماسۆنیەت دروستکراوی مەسیحی دەجالە وە ئاسانکاریە بۆ هاتنی؟

وەلام : بەڵێ، وایە، ئەمە دروستکراوێکی دەجالیە وەئاسنکاریە بۆهاتنی دەجال وەئەوەش دەستەو وولاتی دەجالە کەلەو نێوەندەدا فەرمان ڕوایی جیهان دەکات وەدەسنەگرێت بەسەریدا، واتە ئەوان پیاوی ملکەچ وخزمەتکاری دەجالن وەخەڵکی ئەپەرستن بۆی وە خراپەکاری پیشەیانە.

****




دروشمی ماسۆنی وکۆمەڵەی نورانی وەیەک دۆلاری ئەمەریکی و پەیوەندی بە ماسۆنی و مەسیحی دەجالەوە



یەک چاو هێمای دەجالە وەلە هێماکانی ماسۆنی جۆرلوجۆردا هەیەبەڵکەی پەیوەندی ماسۆنیە بەمەسیحی دەجال. وەحکومەتە نهێنیەکەیەتی کە ئێستا لەو نێوەندەدا حوکمڕانی دەکات



## گرنگترین کەسایەتیە ماسۆنیەکان

ــ گرینگترین کەسایەتی ماسۆنی عەرەبی لە خۆرهەلاتی ناوەڕاست.

ــ گرنگترین کەسایەتیە جیهانیەکان.

پ٩٦: هاوڕێکەم پێی ووتم : ئەمەوێ لێت کە باسی هەندێ لە کەسایەتییە گەورەکان بکەیت کە پەیوەندیان کرد بەماسۆنیەوە و کاریان لەگەڵیاکرد لە وڵاتەعەرەبییەکان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەگەڵ باسکردنی کورتەیەك لە ژیاننامەیان، وەهەروەها ناوی هەندێك لە کەسایەتیە گەورە جیهانیەکان لە ماسۆن؟

وەلآم: کەسایەتیە ماسۆنیەکان زۆرن لەجیهانی عەرەبی و ئیسلامی ، وەپۆستی گەورەیان داگیرکردووە لەووڵاتەکان هەرچەند زۆربەی ووڵاتە عەرەبی و ئیسلامیەکان ئەنجومەنی ماسۆنیان لەووڵاتەکەیان هەڵوەشاندەوە ، بەلآم ئەنجومەنیان بۆ یانەکان دامەزراند کە سەر بەماسۆنین وەك یانەی لوینزو ڕۆتاری ماسۆنی، وەك باسمان کرد.

وەگرنگترین کەسایەتی لەخۆر هەڵاتی ناوەڕاستی ئیسلامی :

ـــ ئەبو عەلائی مەعەرری: ناوی ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵای کوری سلێمان تنوخی یە، وە لە (معرة نعمان ) لەدایك بووە ساڵی ٩٧٢ وەلە ساڵی ١٠٦٠زاینی چاوی کوێربوو، وەبەدرێژایی ژیانی هەر لەماڵەوەبوو خواپەرستی ئەکرد وەناوی نرابوو بارمتەی گیراوەکان وە کوێروو ماڵ، سەردانی تەرابلوس و ئەنقیەی کردبوو وەلەناو راهبەکان هەڵەسا وەوانەی مەسیحی وجولەکەی خوێند وە گەشتی کرد بۆ بەغداد و وانەی خوێند لەسەر دەستی گەورەکانی وەگەرایەوە بۆ شارەکەی خۆی (معرة ) ساڵی ١٩١٠زاینی وەلەماڵەکەی خۆی خواپەرستی ئەکرد.

قسەی زۆری لەسەر ئەکرا پێیان ئەوت کە کافر و گومرایە و پێیان ئەوت دەروێشە.

ـــ شازادە عبدل قادری جەزائیری :

لە قیطنة لە دایك بووە ساڵی ١٨٠٧ زاینی لەووڵاتی جەزائیر، هۆزەکان بەشازادەی خۆیان دایان تا ساڵی ١٨٣٢زاینی وە سوڵتان ی مەراکش پەسەندیکرد وەپیاچونەوەی

جەنگی کرد لەگەڵ فەڕەنسا، وەڕێکەوتنی کرد لە گەڵ مارشاڵ بیجۆ وەئیمارەتێکی بەرفراوانی لەبەردەستدابوو لەنێوان مەراکش و وەهران وە تیتەر و جەزائیری ڕۆژئاوایی.

مەراکیش و فەڕەنسا لەگەڵیدا جەنگان وە وولاتەکەی خۆی بەجێهێشت ساڵی ١٨٤٨زاینی لەگەڵ خێزانەکەی وە چوون بۆ طۆلۆن، وەلەدوای ئەوەی لویس ناپلیۆن بوبە فەرمان ڕەوای فەڕەنسا سەردانی کۆشکەکەی کرد وەئامادەبوو لە چونە سەرتەختی ناپلیۆنی سێیەم وەساڵی ١٨٥٢ چوو بۆ ئیستانە وەدیمەشقی کردە وولاتی خۆی ساڵی ١٨٥٦ زاینی، ئەو یەکەم ماسۆنی دامەزرێنەر بوو کە ماسۆنیەکەی خۆی ئاشکرا کرد لە سوریا، وەلەساڵی ١٨٨٣زاینی مرد.

لێرەدا هەرکێیەك نکۆڵی لە ماسۆنیبونی ئەکات، بەلام بەڵگە لەسەر ماسۆنیەتی ئاشکرایە.

ـ شێخ یوسفی ئەسیر:

لەدایك بووی ١٨١٥زاینی لە(صیداء) دەرچووی ئەزهەرە لەگەڵ محمد علی گەورە دادەنیشت ماوەی مانەوەی لەمیسر، فەتوای (عکا)ی گرتەئەستۆ هەروەها داواکاری گشتی (جبل لبنان). لەچاپکراوەکانی: ((رائد الفرائد)) ، ((شرح أطواق الذهب)) ، ((ردالشم للسهم)) ، ((ارشاد الوری)) ، ((تخطئة جوف الفرا)) ، (( تشکیل الانجیل والتورات)) وەلەساڵی ١٨٨٩زاینی کۆچی دوایی کرد.

ـ میرزا باقر:

نازناوی ئیبراهیمە، لەراگەیاندنەکانی سەدەی نۆزدەیەمە وەئەویش وەك جەمالەدینی ئەفغانی و محمد عەبدە یە لەماسۆنیەتدا، وە خاوەنی کتابی (( ترتیب ایات القره ان))ە

ـ جماله دینی ئەفغانی و قوتابیەکەی محمد عەبدە:

لەدایك بووی ١٨٣٩زاینی، ئەفغانی ڕەسەنە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و فەرەنسی چاك زانیبوە، ماوەیەك لەمیصر نیشتەجێ بووە وەفوناپخانەیەکی چاکساری پێکهێنا وەکۆمەڵێك لەگەنجان دەوروبەیان دابوە لە ئەوەی ئەو سەردەمە وەك عبدالله ئەدیم و مستەفا کامیل و محمد عەبدە وەجەمالەدین چووە ناو ماسۆنیەوە، وەلەپاریس ڕۆژنامەی (العروة الوثقی) ـ پشتو پەمای پتەو ـ ی دامەزراند سالی ١٨٨٤ وە شێخ محمد عەبدە و میرزامحمد باقر لەبەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەکە بوون.

ئەفغانی کۆچی کرد بۆلەندەن و پاریس سالی١٨٨٣ ـ ١٨٨٥زاینی هەروەها بۆ ڕوسیا سالی ١٨٨٦ ـ ١٨٨٩ وەڕۆیشت بۆ میونخ وەتاران وە بەسرە وە لەندەن ١٨٨٩ ـ ١٨٩٢ زاینی .

گۆڤاری ( ضیاء الخافقین) دەرهێنا وەئامادەیکرد بۆهێرشکردنە سەر شای ئێران، بۆ تۆڵە سەندنەوەی کە لەئێران دەریکردبوو، لە (ئیستانە) جێگیر بوو وەتووشی شێرپەنجەی دەم بوو، وەپێی مرد وەنێژرا وەك گشت خەڵکانی تر سالی ١٨٩٧زاینی

ئەفغانی لەلێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ماسۆنی ئیسکتلەندی ووتی: ئەی کۆمەڵی ماسۆن، ئازارم ئەداتێ کەمن ئێستا ئەمزانیوە وەك ماسۆنیەك وەنە بۆهەموماسۆنیەك پێناسیەك کەوێنەیەك درووست بکات لە مێشکدا یان ئەوەسفێك کە بگونجێت لەگەڵ ئەوکەسەی کە ئەچێتە ناو ئەو تایفیە یەکەمجار کە ئارەزوومکرد کاربکەم لەبینایەی ئازادی ـ ماسۆنی ناونیشانێکی گەورەی ترسناك (سەربەستی، برایەتی، یەکسانی) مەبەستی سودی مرۆڤە وەهەوڵیدا بۆ روخاندن و نهێشتنی تاوان وەپێکهێنانی جیهانیکی دادوەرانەی تەواو، وە بەدەست هێنانی من لەهەموو ئەم وەسفانەی ماسۆنی کۆششکردن بوو بۆ کارکردن وە ڕێزی خۆگرتن وەبەکەم تەماشاکردنی ژیان لەپێناو بەرگریکردنی گشت ستەمکارێك. وەبەم وەسفە ڕازیبووم بۆماسۆنی وەڕازینەبم پێی.

وە ئەفغانی ئەنجومەنێکی ماسۆنی نیشتیمانی دامەزراند سەربە ڕۆژهەلاتی فەرەنسی

بوو له میسر ئەندامەکانی گەیشتە نزیکەی سێسەد ئەندام، بەڵام بەهۆی چالاکی سیاسی ئەفغانی تۆفیق خدێوی فەرمان ڕەوای میسر فەرمانیدا بەدەرکردنی له میسر.

وەقوتابیەکانی شێخ جەمالەدینی ئەفغانی بەدوای شێخەکەیان کەوتن بۆچوونە ناو ماسۆنی، وەلەوانیش محمد عەبدە که هەڵخەڵەتا به دروشمەکەی (سەربەستی و برایەتی و یەکسانی) وەتائێستاش ڕاستی ماسۆنیان بۆدەرنەکەوتووە وەیان بۆیان دەرکەوتووە بەڵام ئەیانەوێ تەنها بەڕوکەشی وەریگرن.

ـ سەعد زەغلول پاشا:

لەشاری ((ئەبیانا)) لەدایك بووە ساڵی ١٨٦٠زاینی وەبڕوانامەی ئەزهەری بەدەست هێنا ساڵی١٨٧٨ وەشێخ جەمالەدینی ئەفغانی ناسی وەبووە یەکێك له قوتابیەکانی، وەدوای ڕێبازە چاکسازی و ماسۆنیەکەی ئەکەوێت، لەچەند پۆستێك کاریکرد لەوانەش دادگا وەلورد کرۆمەر هەڵیبژارد بۆ وەزیری معارف ــ پەروەردە ــ ساڵی ١٩٠٧ هەروەها هەڵبژێردرا به بریکاری کۆمەڵەی تەشریعی میسری.

لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم وەفدێکی پێکهێنا بۆ دانووسان لەگەڵ ئینگلیز دەربارەی سەربەخۆیی میسر له ئیمبراتۆری بەریتانی وەپرشنگی شۆرشی ١٩١٩زاینی بەرپابوو.

پارتی وەفدی میسری پێکهێندرا وه سەرکەوت له هەڵبژاردنی پەرلەمانی ساڵی ١٩٢٤ی زاینی وه وەزارەتیان پێکهێنا وەهەروەها بووە سەرۆکی پەرلەمانی میسری، وەدەستی له پۆستی سەرەك وەزیران کێشایەوە وەهەڵبژێردرا به سەرۆکی پەرلەمان ساڵی ١٩٢٥زاینی.

له ساڵی ١٩٢٧ زاینی، کۆچی دوایی کرد. وەکاری پەیوەندیکردن به ماسۆنیەوە لەوکاتەدا کاری ڕۆشنبیران و گەورە سیاسیەکان بوو کەهەڵئەخەڵەتان به درووشمە بریقەدارەکانیان.

وەلە گرینگترین ئەوکەسانە بوو کە داوای عیلمانی ئەکرد وەرۆڵی سەرەکی هەبوو لە
هێنەجێکردنی سفوری لەمیسر وەهەوڵی زۆریدا لە سەرکەوتنی.

ــ داود عمون:

لەدایك بووی ١٨٦٩زاینیە دەرچووی هەردووقوتابخانەی (عینطورة) و (الحكمة) بە
وە ماوەیەك خزمەتی وولاتی تونسی رۆژئاوای کردەوە بە پارێزەری کاریکرد لەمیسر
وەگەرایەوە بۆ بەیروت وەهەڵبژێردرا لە ئەنجومەنی بەرێوەبەرایەتی (جبل لبنان) ساڵی
١٩١٤ زاینی وەلە ١٩٢٢زاینی کۆچی دوایی کرد.

ــ شێخ ئیبراهیمی یازجی:

لەدایك بووی ١٨٤٧زاینی لەدایك بووە لە بەیروت، شارەزای زمان و قەواعیدو ئەدەبی
عرەبی بوو، هەستا بەپوختکردنی دەستەوازەی کتابی پیرۆز ((وەرگێرانی ئەنیانی
یەسوعی)) ساڵی ١٨٧٢ ــ ١٨٨١زاینی، وەهەروەها شاعیر بوو.

لە پیشەسازیە پاشماوەکەی ساڵی ١٨٨٦زاینی بنکەی ناسراو بەپیتی ((سرکیس)) وە
کۆچیکرد بۆ ئەورووپا وە جێگیربوو لەقاهیرە ساڵی ١٨٩٣، وەگۆڤاری (بەیان) ساڵی
١٨٩٧ وە گۆڤاری (الضیاء)ی دەرکرد.

لە(مطریة) لە میسر کۆچی دوایی کرد ساڵی ١٩٠٦زاینی وەتەرمەکەی گولسترلیەوە لە
قاهیرەوە بۆ بەیروت ساڵی ١٩١٣ی زاینی وەلەگۆرستانی زەیتونە نێژرا، وەپەیکەرێکی بۆ
دروستکرا لە دەروازەی کۆلانی(البلاط)، وەگواسترایەوە لەئاهەنگێکدا بۆ باخچەکانی
ژانکۆی بیناساز (( أونیسکو)) ساڵی ١٩٥٧.

ــ محمد رەزا شای پەهلەوی :

شای ئێرانی پێشوو باوەشی کرد بەماسۆنی وەبەڕەسمی بلاوی کردەوە لە ٢٦شوباتی ١٩٥١ لەئەنجومــەنی وەزیرانــی کــەوەرگیراوە مامۆســتایەتی گــەورەی شــکۆمەندی بــۆ ئەنجومەنی گەورەی ئیمبراتۆریەتی ئێرانی .

وەلــە ٢٥نیســانی ١٩٥٢ مەشــخەلی لوتکــەی شــکۆداری ڕۆژهــەلاتی گــەورەی نمونــەیی جیهانی پێبەخشرا.

ـ مستەفا کەمال ئەتاتورك:

ناوی مستەفا علی رەزایە لەسالی( ١٨٨٠ ـــ ١٩٣٨ ) لەسالی ١٩٢٣ بــو بەســەرۆکی تورکیا ئەتاکو کۆچی دوایی کرد.

ڕاگیری ماسۆنی خۆرهەلاتی ناوەڕاست حەنا ئەبو ڕاشد ئەلێت : کودەتای تــورکی ســالی ١٩١٨ کە برای گەورە کەمال ئەتاتورك هاستا پێی وە گرنگترین ئەوانــەی کــەپێی هەستا پالەوانی تورکیای ئەمر:

١ ـــ هەلوەشاندنەوەی یاسای خەلافەت ـ بەدواهاتن ـ
٢ ـــ هەلوەشاندنەوەی دادگا شەرعیەکان.
٣ ـــ هەلوەشاندنەوەی ئیمتیازە بیانیەکان.
٤ ـــ هەلوەشاندنەوەی هەلبژاردنی بۆماوە.
٥ ـــ هەلوەشاندنەوەی یاسای پاشایەتی.
٦ ـــ پوچەلکردنەوەی وەزارەتی ئەقاف.
٧ ـــ پوچەلکردنەوەی ئاینی وولات.
٨ ـــ هەلوەشانەوەی لەقەب و شورەت.
٩ ـــ دروستکردنی تورکیایەکی نوێ .

هەروەها حەنا ئەبوڕاشد دەربارەی ئەلێت : کاتێك ئەتاتورك ئەنجومەنی ماسۆنی ڕاگرت

ماوەیەک وەکەرلندیەوە بەرێز و بەقەدرەوە لەدوای جێگیربوون و چاکسازیکردنی، هەرکێبەک لاسایی ئەتاتورک بکاتەوە لەپیاوانی ماسۆنی پێشوو وە دلنیاتوو ئەوا لاسایی هنری هەشتەم پاشای ئینگلتەرا وە ڕۆزنبرج و لۆتەر و هیتلەرو موسولینی ئەکاتەوە.

وەئەڵێت : هینری هەشتەم پاشای ئینگلتەرا کەنیسەی لە دەوڵەت جیاکردەوە، وە ئەتاتورک ئەو مادەیەی کە ئاینی دەوڵەت ئیسلامە هەڵی وەشاندەوە !

وە رۆزنبرج ووتی: حکومەت گوێنادات بە ڕێنکەڕینکی پیاوانی کەنیسەو قەشەکان، لەبەرئەوەی پێشکەوتنی ڕۆشنبیری گەلی ئەڵمانی گیشتوەتە هەرە کۆتایی وە ئەتاتورکیش هەمان شتی ڕاگەیاند.

وە لۆتەر: سەردەمەکەی چاکسازی ئاین بوو وە بەهەمان شێوەبوو سەردەمی ئەتاتورک کەسەدەی سەربەستی و یەکسانی بوو! !

*وەعامر عەلی : قورئانی پیرۆزی وەرگێڕا بۆ زمانی ئینگلیزی وە ئەتا تورک وەری گێڕا بۆزمانی تورکی.*

وە هیتلەر : هەموپارتەکانی یەککرد لەپارتی نازی وەتێکەڵی حکومەتی کرد، وەهەمانشتیکرد ئەتاتورک لەگەڵ جیایی نێوان دوژمنکاروو بەرگریکار.

وە موسولینی : پێش هیتلەر کەوت، کە لەئیتالیا هیچ پارتێک نەما جگە لەپارتی فاشیستی فەرمانڕەوا وەبەهەمانشێوە بوو پارتی ئەتاتورک.

وە هەروەها لە کەسایەتییەکانی ماسۆن:

ــ سەرۆکی تونسی حەبیب بورقیبە.

ــ سەرۆک ئەحمەد سوکارنۆ.

ــ شازادە بەشیر.

ــ مارون نەقاش ئەستێرەی شانۆی عەرەبی.

ــ بێجگەلە هونەرمەندان و ئەکتەرە گەورەکان لەجیهانی عەرەبی وەك: زەکی تلێمات، محمود ملیجی، محسن سەرحان، وەعبدول حمید حەمدی ، وەزۆرێکی تر.

****

پ۹۷: لە گرنگترین کەسایەتی ماسۆنی لەسەر ئاستی جیهان کێن؟

وەڵام: ئەوانە بەڕۆیشتنی ڕۆژگار زۆربونە وەلەوکەسایەتیانەش:

بەرزترین ئەندامەکانی لەسەرئاستی جیهان:

ــ ئەدیبی ئەڵمانی جوتە.

ــ مۆسیقاژەنی نەمساوی موزار.

ــ سیاسەت مەداری ئیتاڵی غاریبالدی (دامەزرێنەری ئیتاڵیای نوێ).

ــ پاشا جۆرجی شەشەم پاشای بەریتانیا.

- پاشا ئەدواردی حەتەم پاشای بەریتانیا.

- پاشائەدواردی هەشتەم پاشای بەریتانیا.

- ژمارەیەکی زۆر لەشازادەکانی خێزانی شاهانەی بەریتانی لەزیندوان و مردوانی.

- وینستۆن تیشەرشل سەرەك وەزیرانی بەریتانی لە جەنگی جیهانی دووەم.

- سەرۆکی ئەمەریکی پێشوو جورج بۆشی باوك.

- سەرۆکی ئەمەریکی پێشوو بنیامین فرانکلین.

- سەرۆکی ئەمەریکی پێشوو جیرالد فورد.

- سەرۆکی ئەمەریکی پێشوو فرانکلین رۆزفلت.

- سەرۆکی ئەمەریکی پێشوو ثیودۆر رۆزفلت.

- سەرۆکی ئەمەریکی پێشوو هاری ترومان( تاوانباری جەنگ کە فەرمانیدا بە هاویشتنی بۆمبی ئەتۆمی بۆسەر هیرۆشیماو ناجازاکی).

- سەرۆکی ئەمەریکی پێشوو جۆرج واشنتن.

- نوسەری ئەمەریکی مارك توینی.

- شاعیری روسی بوشکین.

- فەیلەسوفی فەرەنسی ڤۆلتێر.

- ئەدیبی ئیسکتلەندی ئوسکار وایلد.

ـ ئەکتەری ئەمەریکی پیتەر سێلەرز.

ـ ئەکتەری ئەمەریکی بۆب هۆپ.

ـ ئەکتەری ئەمەریکی کلارک غیبل.

ـ سیمۆن بۆلیڤار ئازادکەری ئەمەریکای باشوور لەداگیرکەری ئیسپانی.

ـ ئەلیکساندەر فلەمنگ داهێنەری پەنسلین.

ـ تشارلز هلتۆن (خاوەن ئوتێلەکانی هلتۆن).

ـ ئارسەر دۆیل نووسەر(شارلۆک هۆمز).

ـ ئەلیکساندەر پۆشکین (شاعیری ڕوسی کۆچکردوو).

ـ فرانسیس ئەسکوت کی( نووسەری سروودی نیشتیمانی ئەمەریکی).

ـ جۆن سمیس (ئاوازدانەری سروودی ئەمەریکی).

ـ جاکۆ موکازلتوفا(عاشقی ئیتالی).

ـ توماس لیبتۆن (چای لیبتۆن).

ـ فریدریکی دووەم پاشای بروسیا.

ـ پیرنسکونی سەرەک وەزیرانی ئیتالیا.

ـ ئیکیرو هاتو یاما سەرۆک وەزیرانی یابان.

ـ موتسارد (موتزارت) مۆسیقاری جیهانی.

- شازادە ئەدوارد دوق کنت.

- یوهان سابستیان باخ مۆسیقا ژەنی ئەڵمانی.

- بیتهۆڤن میوزیك ژەنی بەناوبنگی نەمساوی.

- کلارك جیبڵ ئەکتەری جیهانی.

- لوویل تۆماس (دۆزەرەوەی لۆرانسی عەرەب).

- رۆتشیڵدی ئەمەریکی.

- ئارسەر کۆناندویڵ سەرکردەی سەربازی ئەمەریکی.

- بد فۆردی ئەمەریکی.

- بنیامین فرانکلین زانای ئەمەریکی.

- مارك توین (نوسەری ئەمەریکی ).

- ئیدی میرفی (ئەکتەری جیهانی).

- والتر سکوت ئەدیبی جیهانی.

- ئوسکار وایلد ئەدیبی جیهانی.

- فرانسس میسمر دامەزرێنەری خەواندنی موگناتیسی.

- لوی ئەرمسترۆنگ ژەنیاری جاز.

- فریدریك بارسولدی دیزاینەری پەیکەری ئازادی.

ـ ڤایکاونت بینیت سەرۆک وەزیرانی کەنەدا.

ـ ڕۆبەرت بیرنز شاعیری نیشتیمانی ئیسکیتلەندا.

ـ ئەندریە سیترۆن بەڕیوەبەری ئۆتۆمبێلی سیتروین.

ـ بوب دول کاندیدی سەرۆکایەتی ئەمەریکی پێشوو.

ـ ئیدوین دیرك بەڕێوەبەری پیشەسازی نەوت.

ـ ئونری جۆن دونانت دامەزرینەری خاچی سوور.

ـ بینجامین فرانكلین یەکێك لە واژۆکەرانی دەستوری ئەمە ریکی .

ـ کینگ جیلیت .

ـ ئەگناس جۆزیف گیوتن .

ـ ئیدگار هۆڤەر بەڕێوەبەری نوسینگەی لیکۆڵینەوەکانی فیدڕاڵی.

ـ دیڤید سارنوف.

ـ ملڤین جۆنز (دامەزرینەری یانەی لیونز).

ـ جیمس نیزمیت داهێنەری تۆپی سەبەتە.

*****

**

## ١٤

## گەڕاوەکانی ناو ماسۆنی

- باسی هەندێك لەوانەی کە پەیوەندیان کردووە بە ئەنجومەنەکانیماسۆنی لە زانایانی ئایینی و ڕووناکبیرانی عەرەب و لێی دەرچوون دوای ئەوەی ڕاستییان بۆدەرکەوت.

- باسی هەندێك لەزانایانی ئاینی چونەتە ناوماسۆنی وەڕاستیەکەیان بۆدەر کەوتووەو وازیان لێی نەهێناوە.

پ٩٨: ئایا هەیە چوبێتەناو ماسۆنیەوە یان لقەکانی وەك ڕۆتاری وەڕاستیەکانیان زا نیبێت و وازیهێنابێت؟

وەڵام: بەڵێ زۆر لە سیاسەتمەدارەکان و زانا ئاینیەکان هەڵخەڵەتان لەناو ماسۆنی و لقەکانی پەیوەندیان پێوەکرد، بەڵام کەبینیتیان وەڕاستیەکەیان بۆ ئاشکرا بوو وازیان لێهێناو وە نهێنیەکانیان ئاشکراکرد.

****

پ٩٩: ئایا ئەتوانیت باسی هەندێك لەوکەسانەمان بۆ بکەی، وەچییان گێڕاوەتەوە لەماسۆنی؟

وەڵام: ماسۆنی بەدروشمە بریقەدارەکانیەوە وەك برایەتی و یەکسانی و سەربەستی زۆربەی خەڵکی و زانایان و سیاسیاسەت مەداران و گەورەکەسایەتیەکانیان بە گشتی وە لەکەسانی هونەرمەند لەخشتەبرد، وەچالاکیە خێرخوازی و سیاسیەکانیان ئەگێڕایەوە بۆ چالاکیەکانی ئەنجومەنی ماسۆنی لە زۆربەی وولاتانی عەرەبی و جیهانی، بەڵام زۆربەی وولاتە عەرەبیەکان لەشەستەکاندا ڕاستی ئەنجومەنی ماسۆنیان بۆدەرکەوت وە بڕیاریان دەرکرد بۆ هەڵوەشاندنەوەیان بۆنمونە لەمیسرساڵی ١٩٦٤زاینی.

وە بەناوبانگترین لەوانەی کە چوونە ناو ماسۆنیەوە وەڕاستیەکەیان بۆدەرکەوت و کشانەوە لێی باسی(یوسف الحاج) دەکەین، کەبەرزەوەبوو لە پلەکانی ماسۆنی هەتا گەیشتە پلەی ٣٣ وەئەوەش پلەی مامۆستای بەئەزمونی گەورەیە، وەسەرۆکی یەکەم بوولەپلەی کورسی شاهانە وە پلەی خاچی پەمەیی بەدەست هێنا، وەنێردراوی مەرگ بوو بۆسەر ڕۆژهەلات سوریا و فەلەستین و عێراق وەئەندامی کۆنگرەی پیرانی دادوەران بوو لەپلەی ٣٠، وەلە فەرمانبەرانی ئەنجومەنی گەورەی میسری، وەسەرۆکی ئەنجومەنی

بەیرووت بوو ژمارە ٢٦١ کە ناونرا بەناوییەوە بۆرینکرتن لێی.

ئەو پیاوەی کە گەیشتە بەرزترین پلەکانی ماسۆنی لەماسۆنیدا وەگیشتە ڕاستیەکەی وەکلیاوەولێی وە نهێنیەکانی دەرخست وەکتابێکی دەرکرد تیایدا پاکبوونەوەی خۆی بلاو کردەوە لەماسۆنی وەنهێنیەکانی تیایدا ئاشکراکرد وە کتابەکەی بەناوی ((گەڕاوە لەناو تاریکی ماسۆنی)).

یوسف الحاج لەکتابەکەی ئەڵێت:

ئەو ئامانجەی کە هەرجولەکەیەك ڕێکی دەخات لەسەر ڕووی زەوی ئەوە ئامانجێکی تایبەتە بەهیچ شێوەیەك پەیوەستنیە بە ئامانجەکانی ئاینی و نیشتمانی و کۆمەلایەتی خەلکی، وەهەڵناستێت بێجگە لە داگیر کردنتان بەهەموو واتای داگیرکاری لە زەبوونی و ڕیسوایی و ستەم و دورخستنەوە، وەئیسرائیل لەسەرووی هەموانەوەیە، وە هەروانەبێت هەتا سەر.

وەهەروەها ئەڵێت: هەرچەند زیاتر جولەکە لەگەڵتان نەرمی بنوێنێت وەهەرچەند بەکۆڵ ئاڵوتتان بۆ بێنن وە لەبەر دەستاندا هەڵبڕێژن، هێشتا هاتنیان بۆ ناو وولاتەکەتان ترسناکە بۆسەر هەموو گەلەکەمان بەگشتی.

وەووتی: لەدوای ئەوەی زانیتیان ـ جولەکەی ماسۆن ــ کە کاریگەرە هێما لایان بۆ سەر دڵی مرۆڤ ماسۆنی گشتی ئەو ڕێگایەی گرتەبەر کە هێمایە بۆ مێژوی جولەکە، کەئەوهێمایانەن کە زۆر ڕونن، وەئەم ماسۆنیەن کە زۆرترین هێما بەکار ئەهێنن.

وەلەزانایانی ئاینی کەچوونەتە ماسۆنیەوە وەلێی دەرچوونە دوای ئەوەی ڕاستیەکەیان بۆئاشکرا بووە، (شێخ محمد ئەبو زەهرە ) زانای ئەزهەری میسری، وەلە ووتارێکی ڕۆژنامەدا بلاویکردەوە ساڵی ١٩٦٤ لەدوای هەڵوەشاندنەوەی ماسۆنی لەمیسر.

ڕۆژنامەنوسەکە لێی پرسی: چۆن پەیوەندیت کرد بەماسۆنیەوە؟ وە بۆچی؟

شێخ ئەبو زەهرە ووتی: ڕۆژێك لەڕۆژان یەکێ لەقوتابیەکانم لێمی پرسی: ماسۆنی چیە؟ وەئامانجەکانی چین؟ یەکسەر بە قوتابیەکەم ووت : لەڕاستیدا من هیچی لێنازانم، بەلام هەوڵ ئەدەم کە بەدوداچونی بۆبکەم بۆئەوەی ولامی پرسیارەکەت بدەمەوە، وەلەوکاتەدا هەندێك ماسۆنیم ئەناسی، وەدەسمکرد بەهەوڵدان لەگەڵیان بۆزانینی ماسۆنی، وەئامانجەکانی، وەلەهەموو جارێکدا ڕوبەڕوی دوو ئالۆزی ئەبوومەوە، یان نەزانینم لەچۆنیەتی پرسیارکردنم دەربارەی ماسۆنی وەهیچم دەست نەئەکەوت ، وەیان لەبەر ئەوەی بەئاگاداریەوە کەپرسیارم ئەکرد هیچم دەسنەئەکەوت.

وەلەکۆتایدا خۆم لەبەردەم ڕێگایەك بینیەوە وەئەوەش پەیوەندیکردنم بە ماسۆنیەوە ئەگەر بمەوێت شتێکم دەست بکەوێت دەربارەی ماسۆنی، وەپەیوەندیم پێیانەوەکرد و دامە دەست خودا.

ڕۆژنامەنوسەکە لێی پرسی: دوای ئەوە چیت زانی دەربارەی ماسۆنی؟

ووتی: زانیم کە جولەکە چەوساوە بوون لە ئەوروپا ئەوانەی کە ماسۆنیان دامەزراند وەکۆمەڵەیەکی نهێنیان لێپێکهێنا بۆپارێزگاریکردن لە بەرژەوەندیەکانیان وەبۆئەوەی دەرچن لەچەوساندنەوە، وەلەڕواڵەتدا پەیڕەوی مەسیحیان ئەکرد بەلام لەژێرەوە هەر جولەکە بوون. وەلەپێناو ئەمەدا وە بۆئەوەی یەکتری بناسن بۆکۆمەڵەکەیان هێمایان دانا وەجوڵەی دەستی دیاریکراو بۆسلاو کردنیان لەیکتری.

وەبەم شێوەیە ماسۆنی کاریکرد لە ژێرەوە وەدەورەی خۆیدا بە شاراوەو نهێنی.

هەروەها ئەگەر کۆمەڵەکە بیەوێت هەنێك لە بیرمەندان و ئەدیبان و سیاسەت مەداران لە دەرەوەی جولەکە بۆئەوەی سۆزیان بجولێت بۆئەوەی لەتەنیشتیان بن درووشمی برایەتی و سەربەستی و یەکسانیان کردە درووشمی خۆیان.

وەبەمە توانیتیان بلاو ببنەوە لەجیهادا وە لقیان هەیە لە چەندەها وولاتانی جیهان.
لەدوای ئەمە جولەکە دەرکەوتەوە جارێکیتر، هەروەها ئەوانەی باوەریان بە مەسیحی هێنابوو لێیان گەرایەوە بۆناو جولەکە جارێکی تر.

رۆژنامەنووسەکە پرسیتی لێی: مەراسیمی پەیوەندی کردنت بەماسۆنیەوە چۆن بوو؟

ووتی: ناو و پیشە و ئاینم تۆمارکرا.

رۆژنامە نووسەکە پێی ووت: بەلام ئێمە ئەزانین ئەندامان مەراسیمی وەرگتنیان بۆدەکرێت یەکەم جار لە ژوورێکی رەشدا، ئایا هیچ دەربارەی ئەو ژوورە ئەزانیت؟

ووتی: پێمیان ئەووتوە بچمە ناو ئەوژورە، بەلام کەوتە بەرچاوم هەیکەلێك کەوتە بەر چاوم دانـدرابوو لەبـەردەم دەرگـای ئەنجومەنەکـە، وەپێمیـانووت: کـەمی یەکێکـە لەئەندامەکان وەبخشیویەتی لەدوای مردنی بۆشەوەی بخرێتە ئەنجومەنەوە، بەلگەی دلسۆزی بۆ ماسۆنی هەتا لەدوای مردنیشی، وەهەستم کرد هەنێ شت هەیە کە هەموو ئەندامەکان نازانن، بەلکو مانەوەم لە یەك ژووردا دیاریکرابوو.

رۆژنامە نووسەکە پێی ووت: ئایا گومانت بۆ درووست بوو لە نیازەکانی ماسۆنی؟

وەلامی دایەوە: گومانم بۆدروست بوو لە یەکەم رۆژەوە، وە تێبینیم کرد کە چەند بالێکی نهێنی هەن لە رووی بیروباوەرو کەسەکانەوە.

رۆژنامە نووسەکە پێی ووت: ئایا لەماوەی سالێکدا توانیت تەنها ئەوەندە بزانیت؟

شێخ وەلامی دایەوە: نەمتوانی لەمەزیاتر بزانم، وەبە گەوجیم دانا کە بەردەوامبم تیایدا وەوازم لەماسۆنی هێنا سالی ١٩٥١.

****

پ١٠٠: ئایا لـە زانایـان یـان سیاسـەتمەدارەیە پەیوەنـدی بەماسـۆنیەوە کردبێت وە ڕاستیەکەی بۆ ئاشکرا بووبێت و وازی لێی نەهێنابێت؟

وەلام: بـەڵێ دوو پیـاو هـەن لـەزاناو سیاسـەت مـەدار چـونە نـاو ماسـۆنیەوە وەئەنجومـەنێکی ماسـۆنیان دامەزرانـد وەڕاسـتی ماسـۆنیان بـۆ دەرکـەوت وە نووسـیان لەدەربارەی، بەلام وازیان لێنەهێنا وەئەوانەش شێخ جەمالەدینی ئەفغانی وەقوتابیەکـەی شێخ محمد عەبدە یە.

لەلێکۆڵینەوەکەی لەسەر ماسۆنی ئیسکتلەندی ئەفغانی ووتـی: ئێمـە کـە کۆمـەلانێکین لەماسۆن من بەداخەوەم لەبەر ئەوەی کەوەك ماسـۆنیەك نـەمتوانیوە پێناسـەی ماسـۆنی بکەم کە وێنەکەی لە مێشکدا دروستبکات، یان وەسفێك ڕێکبێت لەگـەڵ ئـەو تایەفەیـەدا، یەکەم شت کە ئارەزوومکرد کاریکەم لە بینایەی ئازادیخوازان ـ ماسـۆنی ـ ناونیشـانێکی گەورەی ترسناك بوو: (( سەربەستی،برایەتی، یەکسانی)) ئامانجی سوودی مرۆڤ بوو.

بەمشێوەیە ڕوونیکردەوە ئـەفغانی کـە بـە درووشمـی ماسـۆنی هەڵخەڵەتا. وەئەمـەش لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا بوو لە سەردەمی گەشەکردنی ماسۆنی، وە ئەوەی ئەفغانی کە ووتی:

لەڕاستی دوورتر نابینم لەم قسانە لـە ماسـۆنی بەئـەم شـێوەیەی، وەئەریتەکەی نـەك تەنها هەر سەردەمی کۆنە بەڵکو ئێستاش هەر لەبێشکەدایە، وەلەبـەر ئـەوە قسە ئەکـەم وە سوورئەبم ڕۆڵەکانیان بوەستن لەلێواری هێماکان کە زۆربەمان نە لێی تێئەگـەین وەنـە ئەشزانین مەبەست چییە لە دانانی وەئەشخنکێ لەبێشکەدا.

سـەرەڕای قسـەکانی ئـەفغانی لەسـەر ماسۆنی بـەلام هـەر مایـەوە لەماسـۆنیدا بـەڵکو ئەنجومـەنێکی نیشـتیمانی نوێـەمی دامەزرانـدبۆ شـکۆمەندی فەرەنسـیەکان وەژمـارەی ئەندامـەکانی گەیشـتە ٣٠٠ ئەنـدام، وەتۆفیـق خـدێوی فـەرمان ڕەوای میسـری ئەوکاتـە

بڕیارێکی دەرکرد بەدەرکردنی ئەفغانی لەوڵات ساڵی ۱۸۷۹زاینی بەهۆی سیاسیەوە.

بەلام شێخ محمد عەبدە شوێن کەوتەی شێخی خۆی (ئەفغانی) کەوت وەچووە ناو ماسۆنی، وەلەگەڵیا چووە ناو ئەنجومەنی ماسۆنی بەریتانی وە جێی هێلست و چووە ئەنجومەنی شکۆداری فەرەنسی، وەکۆششی کرد لەگەڵ ئەفغانی بۆ دامەزراندنی پارتی نیشتیمانی ئازاد کەوا ڕوبەڕوی ئەنجومەنی ماسۆنی بووەوە.

وەلەوانەی چونە ناو ماسۆنی وە وازی لێهێنا دوای ئەوەی ڕاستیە کەی بۆ دەرکەوت دکتۆر جۆرج حەنا بوو.

****

## نووسەری ئەمەریکی (گی کینی)
## و کتێبەکەی (ئەفسانەی ماسۆنی)

یەکێك لەئەندامەکانی ماسۆنی جیهانی، نووسەری ئەمەریکی ((گی کینی)) هەستا بە نووسینی کتێبێك بەناونیشانی ((ئەفسانەی ماسۆنی))، بۆلابردنی دەمامك لەسەر هەندێ نهێنی ڕێکخراوە پەنهانیەکان کە زۆرکەسی سەرسام کردووە.

وەئەمەش لەتیشك خستنە سەر زۆرێك لە بۆچوونەکانە دەربارەی سرووشتی ڕێکخراوی بیناسازە ئازادیخوازەکان دێت، کەناسراون بە((ماسۆنی)) وەزۆربەی پڕوپاگەندەکان دەربارەی نهێنیەکانی وەتوانینی فەرمان ڕەوایی کردنی بەسەرجیهاندالەپشت خورافیات ، هەروەها لەسروشی نهێنی پارێز کەدەورەی داوە.

وەدەربارەی هۆکاری پەیوەندیکردنی بەماسۆنیەوە، کینی ئاماژەیدا لەچاو پێکەوتنێکیدا لەگەڵ گۆڤاری (( تایم )) ی ئەمەریکی، کەوا ئەو گرنگی ئەدا بە ماسۆنی لە حەفتاکانەوە وەچەندین کتێبی خوێندووەتەوە دەربارەی ماسۆنی، بۆیە زیاتر سەرسام بوو پێی، وەلە ساڵی ۲۰۰۰زاینی بریاریدا کەوا تاقیبکاتەوە وە بچێتە ناو ڕێکخراوێکی بەناوبانگەوە.

کینی ڕونیکردەوە کە هۆی ئارەزوو نەکردنی ماسۆنیەکان لە بانگێژکردنی خەڵکی بۆناو ماسۆنی ئەوەیە (( نایانەوێ خەڵك ناچاربکەن بۆپەیوەندیکردنیان بەبێ ئارەزووی خۆیان، ئەوان ئەیانەوێ ئەوانەی پەیوەندیان پێوەدەکەن بەئارەزووی تایبەتی خۆیانەوە بێت)).

وەدەربارەی مەرجەکانی پەیوەندیکردن بە ماسۆنیەوە، کینی باسی دەکات کە پێویستە لەسەر ئەو کەسە پێش هەمووشتێك لەڕەگەزی نێربێت، وەفۆرمی داواکرنی پەیوەنیکردن پڕبکاتەوە، کەپێك هاتووە لە پرسیار وەك (( ئایا بڕوات بەبوونی باڵادەس هەیە؟))

ئاشکرایە کە ڕێکخراوەکە شوێن کەوتەی ئاینێکی دیاریکراوەوە نیە، لەبەر ئەوەی کە ئەو ڕێگایەی کەپێشکەوت پێی ئامەنگی چونە ناو ماسۆنیەوە پێویستە کەماسۆنی باوەڕێکی هەبێت دیاریکراو نەبێت بەخودا.

جگە لەمانە،بەگوێرەی کینی، پرسیار ئەکرێت لەوکەسەی کە ئارەزومەندە بۆپەیوەنیکردنی بەڕێکخراوەکە، ئایا سزادراوە بەتاوانێکی گەورە، کەئەمە گرنگترین پرسیارە کە مرۆڤ ئەتوانێت لێی دەربچێت یان دەرنەچێت بۆ وەرگرتنی، وەزیاتریش لەمە پێویستە ببێتە ((ماسۆنی دواڕۆژ)) توانای هەبێت بەسەر کەموو کورتی دارایيەکەی وەمشە خۆرنەبێت لەو ئەنجومەنەی کە پەیوەندی پێوەدەکات.

کینی درێژەی پەیوەندیکردنەکەی بە ڕێکخراوەکە ڕوونکردەوەو ووتی: ((کاتێك لایان ئامادەبووم منیان کردە ژورێکی ئامادەکاری، کە هەندێ جل و بەرگی تێدابوو پێویست بوو لەبەری بکەم، وەپاشان پارچەیەك پەڕۆیان دامێ کە چاومی پێببەستمەوە، وە((پابەندبوونم)) یان سوێندخورادنم ئەنجام ئەدرێت لەلای ئەوشوێنی کە قوربانی لێدەکرێت لە ناوەڕاستی ژووری ئەنجومەنەکە، کە سادەیە تەنها مێزێکە ئینجیل یان هەرکتێبێکی پیرۆزی لەسەرە کە ئەو کەسە بڕوای پێبێت)).

((کینی)) درێژەی پێدا:(( گرت ئەدەن بەدەوری ژوورەکە بۆ ناساندنی بەرپرسە سەرەکیەکان، وەلەدوای ئەوە سەرۆکی ئەنجومەن ئەبینی لەبەرامبەرت شەبقەیەکی درێژی لەسەرە، ئەم نەریتانە ئەگەڕێتەوەبۆ سەرەتای سەدەی نۆزدیەم)).

بە بەدوادا چوونی ((کینی)) لەدوای ئاهەنگی پەیوەندیکردن کەئەمەش جێبەجێ دەکرێت بەسەر هەموو پلەکانی ماسۆنی، سەرۆکی ئەنجومەنەکە ووتارێکت بۆئەدات دەربارەی مێژووی کۆمەڵەکەو هێماکانی، کەئەڵێی پیت بەپیت لەبەریکردووە، وەئەوهێماو نەریتانە نەگۆڕدراوە نزیکەی دووسەد ساڵ ئەبێت)).

وە((کینی)) وتی: هەندێك لە نهێنییەکان ئاشکرا نابن، وەك ئەو ڕێگایانەی کەماسۆنیەکان یەکتری پێنەناسنەوە، کە لەڕێگای تەوقەکردنەوە بێت وەیان هەندێ وشە کەلە ئاهەنگەکەدا ئەوترێت، لەبەرئەوەی ڕێکخراوەکە نایەوێت کەسێك بچێتە ناو کۆڕو کۆبونەوەکانیان کەپەیوەندی نەبێت بەو دانیشتنانەوە.

دەربارەی ئەو قسانەی کە گوایە ماسۆنیەکان لەپاشماوەی ((سوارچاکی هەیکەلن))، یەکێ لەبەناوبانگترین جموجۆڵەکانی نهێنی مەسیحی بەکە دامەزرا لەکاتی شەڕەکانی خاچ پەرستەکان، وەلەبەرئەوەی هەوڵ ئەدەن بۆ دانانی یاسایەکی جیهانی نوێ، کینی بۆی دەرکەوت کە زۆرترین ئەوەی کەما سۆنی پویەڕوی بوەوە ئەوڕاستیەیە کە ئەنجومەنکان دەستیانکرد بەخۆ گونجاندن بۆبەردەوام بوون بەژمارەیەکی کەمتر لەئەندامەکان وەبەسەرچاوەیکی کەمتر.

وەنوسەری ئەمەریکی دووپاتی کردەوە کە ژمارەی پەیوەندیکەران بۆڕێکخراوەکان لە پاشەکشێدایە، وەئاشکرایە کەماسۆنی لەئێستادا خۆرەی لێداوە، داوادەکات پێویستە ئەم بابەتە چارە سەربکرێت.

۱۵

## پـلان گێڕیی نـورانییەکان و مـاسۆن

- ئادەم وایز هاوبت پلان و پرۆتۆ کۆلات دادەنێت بۆ دەسبەسەراگرتنی بەسەر جیهان.

- ئاشکراکردنی پلانەکانی نورانیەکان دوای بەسەرچونی کات سالّی ۱۷۸۵.

- دەسبەسەراگرتنی نورانیەکان بەسەر حکومەتەکانی جیهان و گەورە بەرپرسەکانی ولاّتەکان.

پ١٠١: زانیمان ڕێکخراوی نورانیی کە ئادەم وایز هاوپت دایمەزراند لەسەر داراکانی ئالوگۆڕکارەکانی دراووی جولەکە بەسەرۆکایەتی ڕۆتشیلدی جولەکە، ئایا کەی ئادەم وایز هاوپت پەیوەندیکرد بە ئالوگۆڕکارەکانی دراووی جولەکەکان؟ وەکی پلانی دانا بۆدەستبەسەرگرتن بەسەر جیهاندا؟

وەڵام: ئادەم وایز هاوپت مەسیحییەکی کاسۆلیکی بوو، وەبووبە پرۆفیسۆریکی پسپۆڕلەئاینی مەسیحی وەمەسنا بەوانە ووتنەوە لەزانکۆی ئینگلستۆك وەپاشان لەئاینی مەسیحی هەڵگەڕایەوە، وەپەیوەندی کرد بە کۆمەڵەی پلان گێڕانی جولەکە بەسەر جیهاندا ساڵی ١٧٧٠ کە ئالوگۆڕکرەکانی دراو سەرۆکایەتی ئەکەن بۆ تۆڵە سەندنەوە لەمەسیحی وە لەجیهان هەمووی، وە سەرلەنوێ کۆمەڵەی هێزی شاراوەیان ژیاندەوە وەئەم کارەشیان هەمووی سپارد بە ئادەم وایز هاوپت، وەئەوەش ئەو بنچینەیەیە کەپرۆتۆکۆلاتی فەرمان ڕەواکانی زایۆنیزم پێی هەڵسان.

ئادەم وایز هاوپت کۆتایی هێنا بە کارەکانی و پرۆتۆکۆلەکانی لەیەکی ئایاری ساڵی ١٧٧٦ وەکۆمەڵەی نورانیەکانی پێك هێنا.

****

پ١٠٢: بەڵام مێژووی ئایار ڕۆژی یاسایە لە ئەمەریکا، ئایا پەیوەندارە بەو مێژووەوە؟

وەڵام: بەڵێ یەکی ئایاری ساڵی ١٧٧٦ڕۆژێکە لەو ڕۆژانەی ئاهەنگی بۆ ئەگێڕدرێت وەك نەتەوە شیوعیەکان، وەئەوەش ڕۆژی یاسایە بەپێی ئەوەی سەندیکای پارێزەرانی ئەمەریکی کەڕای گەیاند.

پ١٠٣: پیلانی ئادەم وایز هاوپت یان پیلانی نورانیەکان چییە؟

وەڵام: پیلانەکەیا چڕدەکرێتەوە بۆ لەناوبردنی هەموو حکومەتەکانی جیهان وهەموو

ئاینەکانی سەرزەوی، ئادەم وایز هاویت گەلانی دابەشکرد بۆ چەند بەش و کۆمەڵەیەك بۆئەوەی کوشتار ڕوبدات لەناویاندا، وە بە ووشەی (ڕان) ـ مێگەل ـ ناوی گەلانی برد، وەئەم ڕانە ئەبێ لە شەڕوو کوشتاردا بێت هەمووکات، وەکۆمەڵەی نورانیەکان هەڵئەستن بە گواستنەوەی ململانێ و شەڕ لەهەمەوو سەرانسەری جیهان.

نابینن یاخی بووەکانی وولاتە ئەفریقیە هەژارەکان دەستیان داوەتەچەك وە وولاتەکانی بۆنموونە ئاسیاو ئەمەریکای لاتینی، ولات هەیە کەهیچ سەرمایەیەکی نیە وەك سۆماڵ بۆنموونە، وەئەبینین چەك بەدەست چەندەها دەستەو کۆمەڵەی گەلانی ئاکۆك خۆیانی پێئەکوژن لەناو یەکدا، ئەو چەك و تەقەمەنیەیان لەکوێ بوو کە ئەوان خۆراکی ژیانیان دەست ناکەوێ پێی بژین؟ ئەوە هەمووی پارەو سامانی پیلان گێڕانی نورانیە جولەکەکانە.

وەبەندە سەرەکیەکان لە پیلانی وایز هاویت داوائەکات لە نورانیەکان و لایەنگرانی هەستن بەمانەی خوارەوە:

ـ بەکارهێنانی بەرتیلی دارایی یان ڕەگەز بۆدەس بەسەراگرتن بەسەر گەورە پیاوانی وولاتە جۆراو جۆرەکان یان لە بواری ئابوری و کارکردن، هەڕەشەی کوشتن لەهەر یەکێك بیەوێت پیلانەکانیان ئاشکرا بکات، دەست وەردان لە پلانەکانی فێرکاری لە گشت وولاتان وەئاراستەکردنیان بەرەو حکومەتێکی جیهانی، وەهەڵوەشاندنەوەی خوێندنی ئاین بۆ قوتابیان وە گۆڕینی بۆ بابەتی ڕەووشتی گشتی.

وەبلاوکردنەوەی بەخشین بەقووتابیان بۆ شوشتنی مێشکی ئەوە سەرکەوتووەکان لەقوتابیانی جیهان، سێ خوێندنگای تایبەت هەیە کە سەر بە نوورانیەکانە کەلە کۆرۆنز تاون دان (( Cordonstown)) وەلە ئیسکیتلەندا، وەلە سەلیدم (( Saledm)) لە ئەڵمانیا، وەئانا فریتا (( Annavrighta )) لەیونان، وەخوێندنگای دیکە هەن بەلام نهێنین، وە ئەم خوێندنگایانەش منداڵانی هەڵبژاردەی نورانیەکان و لایەنگرانیان تیایدا

ئەخوێنن.

وە دەرچووی ئەم خوێندنگایانە سەرۆکایەتی وڵاتی گەورە و پۆستی گەورە ئەگرێتە

ئەستۆ.

ـ وەلە پیلانەکانی هاوبت دەستبەسەراگرتنی میدیا جۆراو جۆرەکانە.

هەروەها دەستبەسەراگتنی وەزارەتە شکۆمەندلریەکان وەك پۆلیس و سوپا لەوولاتانی جیهانی سێیەم، بۆسەرکوتکردنی هەر جموجۆڵێك یان شۆرشێکی ئازادکردن کەئەتوانن بەسەریا زاڵبن ئەوا پۆلیس هەڵئەستێت لەو وولاتانە بە دەست بەسەرگرتنیان و سەرکوت کردنیان.

****

پ١٠٤: بۆچی پیلانەکە رانەگیرا لەکاتی خۆی؟

وەلام: لەساڵی ١٧٨٥ حکومەتی بافاریا هەستا بەئاگادارکردنەوەی کۆمەڵی نورانیەکان لەدوای ئەوەی کە بەڵگەنامەی تاوانبارکرنی کۆمەڵەکە کەوتە دەستی پۆلیس، وەپیلانگێریەکەی بۆسەر ئەوروپا ئاشکرابوو وەهەموو ئەنجومەنەکانی رۆژهەلاتی گەورە داخرا.

وەلەساڵی ١٧٨٦، حکومەتی بافاریا ((ئەڵمانیا)) هەستا بە بلاو کردنەوەی دریژەی گشت پیلانەکان لە پەرتوکێك بەناو نیشانی ((نووسراوە بنچینەییەکانی رێبازوو هێزەکانی نورانیەکان)). وەکۆپیەك لە تەواوی پیلانەکەی نارد بۆ گشت سەرۆکی کەنیسەکان و حکومەتەکان لە ئەوروپا.

بەلام دەسەلاتی نورانیەکان کەهێزی داراییەکەیان لە خێزانی رۆتشیلدەوە زۆر گەورەبوو بە پلەیەك کە ئەو ئاگادارکردنەوەیە لەترسناکیەکانی پیلانەکەوەیە، بە تیری

بچووك تەماشايان نەكرد وەفەرمانەكانی وایز هاویتی دەركرد بۆنورانیەكان كە بچنەناو كۆمەڵی ماسۆنیەوە، وەبگۆرێن بۆ ماسۆنی هێمای شین.

وەكۆمەڵەیەكی نهێنی تایبەتیان پێكهێنا وەرێگایان پێیان نەدا بە پەیوەندیكردنیان بە كۆمەڵەی نورانیەكان تەنها بە ماسۆنیەكان نەبێت ئەوانەی كە دەركەوت كە باوەڕیان بە یەك حكومەتی جیهانی هەیە، وەئەوان وازیان هێنا لە ئاینەكەیان وە بڕوابونیان بەخودا، وە نورانیە ماسۆنیەكان كردارە پیلانگێڕیەكەیان شاردەوە بەدرووشمی بریقەدار، وە درووشمی سەربەستی و برایەتی و یەكسانیان هەڵبژارد كە بووە درووشمی شۆڕشی فەرەنسی كە ماسۆنیەكان ماندەروو جێبەجێكەری بوون.

****

پ١٠٥: گرنگترین ئامانجەکانی ماسۆنی بەجولەکەبووی جیهانی چین؟

وەڵام: دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەرخاکی فەلەستین کەپێی ئەڵێن خاکی بەڵێندراو، وەلەچوارچێوەی ئەو دەوڵەتە فەرمان ڕەوایی جیهان ئەکەن هەروەك لە سەردەمی پێغەمبەر پاشا سلێمان کوڕی داود سەلامی خوایان لێبێت، وەلەپێناو ئەوەدا ئەوان هەوڵەدەن بۆ دروستکردنەوەی هەیکەل سلێمان لەشوێنی مزگەوتی ئەقسا.

****

پ١٠٦: لەسەر بەلگەنامەی پاشایەتی لای ماسۆن چی نەخشێنرابوو؟

وەڵام: بەلگەنامەی پاشایەتی لای ماسۆن میلوانکەیەکە ناوی دوولنزە نەوەکەی بەنی ئیسرائیلی *(دوانزە کورەکەی پێغەمبەر یەعقوب)* تیا نەخشێنراوە.

****

پ١٠٧: پلەکانی شاهانەی ماسۆنی بەرامبەر بەچین؟

وەڵام: بەرامبەر بە ناوی پاڵەوانەکانی دیلەکانی بابلی.

****

پ١٠٨: ناوی زربابل چینە گەیەنێت لەماسۆنیدا؟

وەڵام: ناوی یەکێکە لە پاڵەوانەکانی دیلەکانی بابلی.

پ١٠٩: بنچینەی ماسۆنی چییە؟

وەلام: بنچینەی ماسۆنی کۆمەڵەی هێزی شاراوەیە کە هیرۆدوس پاشای دووەم دایمەزراند سالی ٤٣ی زاینی.

****

پ١١٠: کەی ئەنجومەنی گەورە دامەزرا لەبەریتانیا؟

وەلام: سالی ١٧١٧ زایینی.

****

پ١١١: هێمای یەهوذا واتای چی ئەگەیەنێت لای ماسۆن؟

وەلام: واتا مامۆستای گەورە.

****

پ١١٢: ژمارەی دامەزرێنەری هێزی نهێنی چەندبوو سالی ٤٣ زاینی؟

وەلام: نۆ پیاو بوون.

****

پ١١٣: کێ بوو ڕازگری کۆمەڵەی هێزی شاراوە لەدامەزراندنیدا؟

وەڵام: موناب لامی.

****

پ١١٤: کێ یەکەم کەس بوو ماسۆنی هێنایە عێراقەوە؟

وەڵام: یوسف الحاج.

****

پ١١٥: کەی ماسۆنی دەرکەوت لە میسر؟

وەڵام: ساڵی ١٧٩٨ زاینی.

****

پ١١٦: کێ بەرپرسی یەکەمی ماسۆنی بوو لە میسر ساڵی ١٨٧٣؟

وەڵام: ئیسماعیل خدێوی پاشای میسر.

****

پ١١٧: کێ دامەزرێنەری ئەنجومەنی ئیزیس بوو لەمیسر ساڵی ١٧٩٨؟

وەڵام : جەنەڕاڵی فەرەنسی کلیبەر.

****

پ١١٨: کەی ئەنجومەنی ماسۆنی هەڵوەشێنرایەوە لە میسر؟

وەڵام: ساڵی ١٩٦٤.

پ١١٩: کێ دامەزرێنەری ڕێکخراوی ڕیفۆرمی ماسۆنییە؟

وەڵام: مارتن لوثر.

****

پ١٢٠: کەی فەرمانی پاپۆی دەرچوو لەئەنجومەنی باڵای پیرۆز لەڤاتیکان کەماسۆنی و ڕۆتاری ئیدانە ئەکات؟

وەڵام: ساڵی ١٩٥٠.

****

پ١٢١: کێ یەکەم کەس بوو هەستا بەدامەزراندنی ئەنجومەنی ماسۆنی لە شاری فلورەنسا بە ئاشکرا و بەفەرمی ساڵی ١٧٣٣؟

وەڵام: شازادە مید میلنجەر.

****

پ١٢٢: کام مانگ مانگی غەمناکییە لای جولەکە و ماسۆن؟

وەڵام: مانگی ئاب وەهۆیەکەشی ئەوەیە لەو مانگەدابوو کە بەسەرکردایتی تیتس ی کوڕی پاشای ڕۆمانی هەیکەلی قودسی تێکدا.

****

پ١٢٣: کێ دامەزرێنەری ماسۆنی نوێیە؟

وەڵام: ئادەم وایز هاوپت، وە هەروەها دامەزرێنەری کۆمەڵەی نورانیەکانە هەروەك

باسمانکرد له ئەڵمانیا (بافاریا).

****

پ١٢٤: جەژنی ساڵانەی ماسۆنی چییە؟

وەڵام: جەژنی ساڵانەیان له ٢٤ی حوزەیرانە کەئەکەوێتە ڕێەوتی جەژنی ماریۆ حەنا، که جەژنی دامەزراندنی ماسۆنیه کەلە ٢٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٧١٧ دامەزرا.

****

پ١٢٥: ناوی یەکەم ئەنجومەنی ماسۆنی چی بوو لەلەندەن ساڵی ١٧١٧؟

وەڵام: ئەنجومەنی ئۆرشەلیم.

****

پ١٢٦: ماسۆنی گەلی عەرەب و گەلانیتر جگە له جولەکە بەچی ناویان ئەبات؟

وەڵام: جگە لـه جولەکـه گـەلانیتر بـه ((ڕان)) ناودەبـات وه عـەرەبیش بـه ((گـورگ)) ناودەبات.

****

پ١٢٧: بەرزترین ئامانجی ماسۆنی لەدوای دەسبەسەراگرتنی بەسەر جیهاندا چییە؟

وەڵام: بەرترین ئامانجی لابردنی بیرو باوەڕی ئاینیه لەناو گەلانـدا وه ناچـارکردنیان بـۆ شوێن کەوتنی مەسیحی دەجالی چاوەڕوانکراو کـه بانگەشـەی خـودایی ئـەکات، وەئـەوان گەلان ڕادێنن بۆ پەرستنی دەجال.

پ١٢٣: ئەوسزایە چییە کەماسۆن دەریئەکات بۆسەر ماسۆنێك کەلە بڕیارەکانیان دەربچێت؟

وەڵام: مردن.

****

پ١٢٤: کەی کۆمەڵی هێزی نهێنی ماسۆنی دامەزرا؟

وەڵام: لە ٢٦ی حوزەیرانی ساڵی٤٢ زاینی.

****

پ١٢٥: بۆچی ئەوانەی داوای بەرزبوونەوەی پلە ئەکەن بۆپلەی باڵا لە ناو ماسۆنی پێڵاوەکانیان دائەکەنن لە ژووری بەڵێن نامەی پاشایەتی؟

وەڵام: هاوشێوەکردنی پێغەمبەر مووسا سەلامی خوای لێبێت کاتێك کەخودا فەرمانی پێدا کە نەعلەکانی داکەنێت لە (وادی المقدس) وەماسۆنی جولەکە مەسیحی دەجال ئەپەرستن، وە ژووری پەیمانی پاشایەتی وەك وادی المقدس دائەنێن.

****

پ١٢٦: واتای هێمای ((جاکی)) چییە لای ماسۆن؟

وەڵام: واتای مامۆستا.

****

پ١٣٢: شێوەی بڕواو هێمای ماسۆنی چین؟

وەڵام: ماسۆنی جولەکە هێماو بیروو باوەڕەکانیان لە شاینی فێرعەونیێ کۆنەوە وەرگرتووە وەگرنگترین ئەو هێمایانە چاوی حورسە کەئەمەش چاوی دەجالە.

****

پ١٣٣: بەشەکانی ماسۆنی جیهانی چین؟

وەڵام: ماسۆنی جیهانی سێ بەش یان سێ کۆمەڵن وەئەوانەش: ماسۆنی گشتی، ماسۆنی پاشایەتی، ماسۆنی گەردوونی.

****

پ١٣٤: کەی کۆیلە کردنی بابلی دەستی پێکرد؟

وەڵام: لەدوای شاکاندنی جولکەو وێرانکردنی وولاتەکەیان بەدەستی پاشای بابلی(( نەبوخوز نەسر )) وەبردیانی بۆ بابل ساڵی ٥٨٦ی پێش زاینی.

****

پ١٣٥: نازناوی ئەندام چیە لە ماسۆنیدا؟

وەڵام: هاوڕێ یان برا.

****

پ١٣٦: کەی پاشا هێردووسی دووەم دامەزرێنەری هێزی نهێنی مرد؟

وەڵام: ساڵی ٤٤ زاینی.

پ١٣٧: ئایا کۆمەڵەی ماسۆنی بەچی ناونەبرێت لای ماسۆنی؟

وەڵام: پێی ئەوترێت هێز.

****

پ١٣٨: کێ یەکەم سەرۆکی هەیکەلی ماسۆنی بوو لە ئورشەلیم دوای دامەزراندنی هێزی نهێنی؟

وەڵام: حیرام ئابیود.

****

پ١٣٩: حیرام ئابیود لەکوێ کوژرا؟

وەڵام: لە شاری سەیدون لە لوبنان.

****

پ١٤٠: شێوەی ڕێکخستنی ماسۆنی لەڕووی ئەندازەییەوە چۆنە؟

وەڵام: شێوەیەکی هەرەمی یە.

****

پ١٤١: کێ فەرمانیدا بە وێنەکێشانی ئەستێرە وە دانانی لە سنگی هەیکەلی هێزی نهێنی؟

وەڵام: حیرام ئابیود.

"سوپاس بۆخودای گشت جیهان"

## کۆتایی

## سوپاسی بێپایانم بۆ بەڕێزان:

- مامۆستا موحەممەد محێدین کە پێداچوونەوەی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆ.
- مامۆستا هیوا ڕەفعەت کە ئەرکی نەخشەسازیی بەرگی گرتە ئەستۆ.

نهێنی و ڕاستییەکانی

# ماسۆنیەت

لە پرسیار و وەڵامدا

نووسینی: منصور عبدالحکیم

وەرگێڕانی: ئەمین بەرزنجی





- ماسۆنی لە کۆنترین ڕێکخراوە نهێنییەکانە لە جیهان کە نهێنی دەورەی داوە، و ئەمەش جیهانی نهێنی و پیلانە جیهانییەکانە بە تێپەربوونی مێژوو، کۆن و نوێ، واتای وشەی ماسۆنی: بیناسازە ئازادیخوازەکان (Free masons).

ئەمەش بریتییە لە ڕێکخراوێکی برایەتی جیهانی کە بەنهێنی و ناڕوونی وەسف ئەکرێت، بەتایبەتی لە هێماکانی لە سەرەتاکانی دامەزراندنییەوە کە وایلێکرد ببێتە شوێنی زۆربەی هەواڵەکان، لەبەر ئەمەش هەندێك ماسۆنی تاوانبار ئەکەن کە دژایەتی ئایین ئەکەن و لەپشت جەنگە جیهانی و شۆڕشە جیهانییەکانەوەن وەك شۆڕشی فەڕەنسی و ڕوسی و ئینگلیز و شۆڕشەکانی تر کە ڕێڕەوەکانی مێژوویان گۆڕی...

هەروەها ڕێکخراوێکی ڕامیاری و ئابووری بەهێزە، و ئامانجی سەرەکی دەستبەسەراگرتنی جیهانە لە ڕێی زاڵبوونی بەسەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ئابووریی جیهانی و ئاڵۆزی نانەوە لە ڕیزەکانی کەنیسەی کاسۆلیکی و دەربارەی کاسۆلیکی نوێ ئەوا هۆزەکانی وەك هۆزی (شهود یهوە) کە هۆزێکی مەسیحییە و هۆزی (مۆرمۆن)ی مەسیحی و باڵە ڕامیاریەکان وەك شیوعی و سۆشیالستی و شۆڕشی فەڕەنسی و بزوتنەوەی مستەفا کەمال ئەتاتۆرك ئەو باڵانە هەمووی لە ماسۆنی لقی لێبووەتەوە. بابەتی باڵەکان کە ڕێگە ئەدات بە کردارێنادروستی ڕەگەزی لە نێوان گەورەکانی ناو کەنیسە دروستکراوی ماسۆنییە..

لەسەر شێوازی ماسۆنی و دامەزراندنی و گرنگترین هێماکانی و مەرجەکانی بەئەندامبوون و پەیوەندیکردن پێیانەوە ئاهەنگی تەرخانکردن و بەرزکردنەوەیان لە ٣٣ پلەکەیاندا هەروەها دەستووری ماسۆنی ئەخوێنیتەوە کە لە ساڵی ١٧٢٣ زایینی، جیمس ئەندرسۆن نووسیویەتی.

دەربارەی کەسایەتییە گرنگەکانی ماسۆنی لە جیهانی عەرەبی و جیهانی ڕۆژئاوای کۆن و نوێ ئەخوێنیتەوە، وەك: ئەبی عەلائی مەعەڕی و شازادە عەبدول قادری جەزائیری و جەمالەدینی ئەفغانی و قوتابییەکەی موحەممەد عەبدە و سەعد زەغلول و موحەممەد ڕەزا پەهلەوی و کەمال ئەتاتورك و کەسانی دی، ئەخوێنیتەوە.

مێژووی ماسۆنی لە میسرو وڵاتانی عەرەبی و چۆن دامەزران و کەی هەڵوەشانەوە، هەروەها لقەکان و برایانی ماسۆنی ئەخوێنیتەوە وەك ڕۆتاری و لیونز، و تاوانی پەیوەندیکردن بەم ڕێکخراوانەوە لە ڕووی ئایینی ئیسلامەوە.

زۆر لە زانیاریی گرنگت دەست ئەکەوێت دەربارەی ماسۆنی لەم پەرتووکە، لە نووسەرێکی بەتوانا لەم بوارەدا.